# كوردو كوردستان
# له هونەری هونەرمەندی شۆڕشگێڕ
# یەڵماز گۆنایدا 1937 -1984

**نووسین و ئامادەکردن و گۆڕینی : حەمەکەریم عارف**

## پێشەکییەکی گشتی

یەڵماز گۆنای هونەرمەندی شۆڕشگێڕ، لایەلایەی شۆڕشگێڕانەی دەزانی. ژانەکانی ئینسانی بەگشتی و ژانی مرۆڤی کوردی بەتایبەتی دەلاواندەوە. کەچی بۆ خۆی هەرگیز خەوی لێنەدەکەوت! خەوی بە برای مەرگ دەزانی. هەر ئەم هەمیشە بێدارییە وای لێکرد بکەوێتە بەرچاوی کاربەدەستانی رژێمی دیکتاتۆریەتی تورکیاو لە وڵاتی خۆیدا جێی نەبێتەوە.

گۆنای لای وابوو زیندان مەڵبەندێکی گەلەك لە بارە بۆ زاوزێکردنی بیری شۆڕشگێڕانە، بۆیە وێڕای ئەوەی پتر لە دوانزە ساڵی تەمەنی بوو بە خۆراکی زیندانەکانی رژێمی تورکیا، ئەو هەر سوور بوو لەسەر بیرو ئامانجی شۆڕشگێڕانەی خۆیو فیلمی وەك رێگاو دیواری بەرهەمهێنا.

گۆنای چالاکی هەنەری خۆی بە نووسینی کورتە چیرۆكو رۆمان دەسپێکردووەو* پاشان رووی کردۆتە جیهانی فیلمو سینەما. گرنگترین فیلمی گۆنای "رێگا"یەکە لە دەرەوەی تورکیادا بەرهەمی هێناوەو شۆڕەتێکی جیهانی پێبەخشی. دیوار، دوا فیلمییەتیو لە فەڕەنسادا بەرهەم هێنراوە. دیوار پەردە لە رووی بارودۆخی نامرۆڤانەی ژێر زەمینو زیندانە تاریکەکانی رژێمی تورکیا لادەدات.

گۆنای توانی پاش کۆدەتا سوپاییەکەی 1980ی تورکیا خۆی لە زیندان دەرباز بکاتو بگاتە ئەورووپا. گۆنای لە ساڵی 1937دا لە خێزانێکی هەژاری کوردستانی تورکیادا هاتۆتە دنیاوە.

گۆنای یەکێك بوو لەو هونەرمەندە شۆڕشگێڕە مولتەزیمانەی کە دەیوست لە رێگەی فیلمەکانییەوە پەردە لە رووی ناحەزی رژێمی تورکیا لابداتو بە هەموو خەڵکی جیهانی بناسێنێ. گۆنای، زۆری پێ بوو. بەڵام مخابن مەرگ بواری نەدا، لە رۆژی یەك شەممە، رێکەوتی 1984/9/9دا بە نەخۆشی شێرپەنجە لە پاریس کۆچی دوایی کردو هەر بە ئاوازی لایەلایەکانی خۆی لە پڕو بە یەکجاری خەوی لێکەوتو بوو بە کۆستو کەسەرێکی گەورە لە دڵی خەڵکی کوردستانداو ئەستێرەیەکی گەشی جیهانی هونەری سینەما راخۆشیو خامۆشبوو.

**سەرگەڵو** 1984

"1"

## (( یەڵماز گۆنای باسی خۆی دەکات ))

من لە دێهات لە دایك بووم. داكو بابم جووتیاری هەژارو دەستکورت بوونو بە بنەچەو رەچەڵەك کورد بوون. هەر بۆیەش بیر کردنەوەی جوتێری هەوێنی هزرو بیری پێکهێناوم. دیارە بیرکردنەوەی جووتیارانیش بە شێوەیەکی گشتی دەڕژێتە رووباری بیرو بۆچوونی بۆرژواوە. دیارە من کە بەخۆم رۆڵەی ئەو جوتیارە هەژارو بێنەوایانە بوومو لە نێو واندا گەورەو پەروەدە بوومەو سەر بە نەتەوەی کوردی چەوساوە بووم، هەموو ئەمە کاری لە بیرۆبۆچوونم کردبوو. واتە دەنگدانەوەو رەنگدانەوەی ئەو کەشو هەوایە لە بیرو جیهانبینی مندا دیار بوو. ئیدی ئەمە جۆرە خولیایەکی لەلا دروستکردم.خولیای چی؟! بەخۆیشم نەمدەزانی. دەگەڕام, لە شتێك دەگەڕام. ئەوە بوو لە سەرەتاکانی سالآنی پەنجادا, سوکە ئاشنایەتیەکەم لەگەڵ شیعری نازم حیکمەتی شاعیری کۆمۆنیستی تورکیادا پەیدا کرد، ئەو شیعرانەی دەربارەی جەنگی میللی ئەسپانیا بوو. لە ساڵی 1952دا لە وڵاتی تورکیا رەشبگیری کۆمۆنیستان دەستپێکرد، لەو رەشبگیرەدا چەند شاعیرێکیش بەرکەوتنو گیران. ئیدی کەوتمە خوێندنەوەو موتالآی شیعری وانیش... هەڵبەتە بەنهێنی، دەنا ئەو شتانە لە تورکیادا قەدەغە بوون. هەر زوو بۆم بە دیارکەوت کە ئەمانە پتر سوسیالیستی خەیاڵین تا سوسیالیستی زانستی بن. کەس باسی چینی کرێکاری نەدەکرد، کەس باسی "مارکسیزم– لینینزم"ی نەدەکرد. مەتریالیزمی دیالیکتیکی هەر کەس باسی نەدەکرد. ئەوەی هەشبوو لە چوارچێوەی ئەدەبو لە بندێڕی ئەم دەقو ئەو دەقدا خۆی دەنواندو چ چارەسەرێکیان بۆ هەژاریو دەستکورتیو گۆڕینی رەوتی ژیان پێ نەبوو. بە هەر حاڵ بەو حاڵەشەوە من لە کاریگەری ئەوان بەدەر نەبووم. ئیدی بە تەئسیری ئەوان دەستم دایە قەڵەمو هەستی پەنگخواردووی ناخی خۆم هەڵڕشتە نێو قاڵبی کورتە چیرۆکانو بۆ یەکەمجار نێوم کەوتە نێو ناوانو "خەفیە" ناسیانم.

لە ساڵی 1955دا کە هێشتا خوێندکار بووم، لەسەر کورتە چیرۆکێکی هەندێ بەسۆزو گوداز، بە تۆمەتی ئەوەی پڕوپاگەندەم بۆ کۆمۆنیستان کردووە، درامە دادگا، لەسەر کورتە چیرۆکێکی سوزاوی دادگاییەکی دوورو درێژیان کردم.. ئەوە بوو لە ساڵی 1961دا بە دوو ساڵو نیو زیندانیو دوورخستنەوە مەحکوم کرام. لە ماوەی دادگایی کردنەکەداو لە ساڵی 1957دا بە ناچاری شاری ئەدەنەم، کە لەوێندەر گەورە بوو بوومو تەمەنی هەرزەکاریم لەوێ قەتاند بوو، بەجێهێشتو بەرەو ئەستەمولْ سەری خۆم هەڵگرتو کەوتمە سۆراخی حیزبی کۆمۆنیست هەر چەند من هێشتا ئەم حیزبەم نەدەناسی، کەچی خەڵکەکە هەر بە کۆمۆنیستیان دەزانیم... بۆیە بەرەو ئەستەمولْ وەڕێکەوتم.

هەر چەند هەستم دەکرد فریودراوم، کەچی بە هەر کۆمۆنیستێك دەگەیم هێندەی دی بێهیواو ناهومێد دەبووم، هەرچیشم دەکرد نەمدەتوانی دەرەقەتی ئەو مەسەلەیە بێمو لێکیبدەمەوە... ئەوەندەم دەزانی فریودراومو هیچی دی... ئەوە بوو لە ساڵی 1972دا جارێکی دی گیرامو دە زیندانێ پەستاوترام. ئیدی دەستم بە خوێندنەوەی ئەدەبیاتی مارکسیزم– لینینزم کرد. بۆم بە دیار کەوت کە من تەفرەدراوی لادەرانو ریڤیژنیستانم... ئیدی سالآنی 1961– 1963م لە

زینــدان‌و دوور خراوەییــدا بەســەر بــردوو لــە ســاڵی 1963وەش قۆنــاغێکی دیکــەی ژیــانم دەستپێکرد. لە ساڵی 1963داو لە زینداندا لێبڕام ببم بە ئەکتەرو لە هەموو وڵاتدا نێـوو شـۆرەت پەیدا بکەم‌و لەو ڕێگەیەوە بە ئاوات‌و ئامانجەکانم بگەم... دیارە ئەمە هەر بڕیاری رووت نەبوو، بەڵکو کاروکردەوەو پرۆڤەشی دەگەڵدا بوو. ئیدی وام لێهات لە ساڵی 1965دا بووم بە یەکێك لە ئەکتەرە هەرە نێودارەکان‌و گەییمە هەرەتی شۆرەت, من ناتوانم بڵێم ئەو فیلمانەی کە دەورم تێدا دیتوون شۆڕشگێڕانەبوون یان دیموکراسییانە، بەڵام هەر هەموویان فیلمی جەماوەری بوون... رەنگدانەوەی ئێش‌و ئازارو خۆزیاو ئاواتی ئەوان بوون. زۆر لەم فیلمانەش لە باری بۆچوونی سیاسییەوە لە هەڵەو کەموکوڕی بەدەر نەبوونە. هەندێکیان کاوبۆیی بوون. بەڵام هەر ئەو ئەزموونانەش بوون کە پەیوەندییان لەگەڵ جەماوەری خەڵکیدا بەرفراوان کردم. لە ساڵانی 1965– 1966دا، لەوپەڕی نیگەرانیدا بووم‌و کارەکانم شادو بەختەوەریان نەدەکردم... لەو ساڵانەوە کەوتمە سەر ئەو رایەی کە تەنیا لە فیلمی بەسوودو ئامانجداردا کار بکەم. خۆم دەور بۆ خۆم هەڵبژێرم. بەڵام بێ پارەیی‌و دەستکورتی ناچاریان کردم لە چەند فیلمێکی بێکەڵك‌و خراپیشدا بەشداربیکەم. من دەبوایە خۆم بە جەماوەر بناسێنم تا لەو ڕێگەیەوە ئامانجەکانم بەدی بهێنم. دەبوایە وەکو ئەکتەر بمێنمەوە تا تەواو پێبگەم‌و پاشان بە خۆم فیلم دەربکەم، لە ساڵی 1966ـەوە وردە وردەی کەوتمە پەروەردەکردنی ئەم خەونەم... ئەوە بوو لە ساڵی 1968ـەوە، پاش یەکەمین هەوڵم وەکو دەرهێنەری فیلم، گیرام بەسەربازو ئەمەش دوو ساڵی خشتی خایاند. لەو دوو ساڵەدا بۆ یەکەمجار دەرفەتم بۆ رەخسا کە بە بەردەوامی بخوێنمەوەو لە خوێندنەوەی پچڕپچڕو پەراگەندە دوور بکەومەوە. لەم ماوەیەدا بە بەرنامەو بە بەردەوامی کتێبەکانی مارکس‌و ئەنگلس‌و ماو-م خوێندەوە... ئیدی خۆم تەیارو ئامادەکرد کە هەر لە سەربازی تەواو بووم ئیدی بتوانم هەنگاوی گەورە بنەم. ئەوە بوو لە ساڵی 1970و پاش تەواو کردنی خزمەتی سەربازی فیلمی "جگەرگۆشە"م دەرهێنا. بۆ دابینکردنی مەسرەف‌و خەرجی ئەو فیلمە بە ناچاری لە چەند فیلمێکی عەسابەدا دەورم بینی.

هەر لەو سەرو بەندەدا. چونکە هەڵوێستێکی رون‌و ئاشکرام نەبوو، رووم لە زۆر بزووتنەوەی جۆراو جۆر کرد... بزووتنەوە زۆر بوون. بزووتنەوەی خوێندکاران هەبوو، بزووتنەوەی کرێکاران هەبوو کە دژ بە هێزە کۆنەپەرستەکان بوو، منیش کۆمەکم دەکردن‌و هاوکاریم لەگەڵ دەکردن... لە ساڵی 1972دا ئەندامانی یەکێك لەو ڕێکخراوانەی کە منیش لایەنگریان بووم، گیران‌و منیش بە تۆمەتی تەرەفداری لەوان دەستگیرکرام. گرتنی ئەمجارەم جۆرە گۆڕان‌و وەرچەرخانێکی لە ژیانمدا چێکرد. فێری زانستی مارکسیزم- لینینزم بووم. فێری شۆڕش بووم، نێوەرۆك‌و ماهیەتی سۆڤیەتم بۆ دەرکەوت، تەحریفیەتم ناسی... ئەو وەختە نەدەوێرام سۆڤیەت، بە وڵاتێکی سۆسیال- ئیمپریالیزم لە قەڵەم بدەم، بەڵام دەمزانی دەوڵەتێکی سوسیالیستی نییە، هەر لەو سەرو بەندەدا توانای ئەوەم پەیدا کرد کە ئەو رەوتە سیاسیانەی خوردە بۆرژوایان ڕێبەریاندەکرد، جیابکەمەوە لەو بزاڤو رەوتە سوسیالیستیانەی کە دەبێ هەبن‌و جێی خۆیان بگرن. فێری ئەوە بووم کە چۆن کرێکار پێشڕەوەو فێری ئەوە بووم هەڵوێستی شۆڕشگێڕانە بۆ

خۆم هەڵبـژێرم... دەربـارەی فـیلمو سـینەماش، راوبۆچـوونو زانیـنم تـەواو گـۆڕان. ئـەوە بـوو لـە سـاڵی 1974دا لـە زینـدان بـەربووم. بـە خۆمـدا رادەپـەڕمووم کـە لـە بـواری دەرهێنـاندا هـەنگاوی گەورە بنەم. لێ تەنێ فیلمی "هاوڕێ"م تەواو کرد. لـە کاتێکدا سـەرگەرمی فیلمـی دووەمـم بـووم، دیسانەوەو لە ساڵی 1974دا گیرامو دەزیندانێ پەستاوترام.

لـە سـاڵانی 1974- 1981دا لـە زینـدان بـووم. لـەو ماوەیـەدا زۆر کـاری نووسـینی وەکـو کورتـە چیرۆکو رۆمـانم ئەنجامـدان. لـە پـاڵ ئەوانـەدا گوتـاری سیاسیشـم دەنووسـین... وەکـو دەرهێنـانی فیلمیش پێنج هەوڵمدا... یەکەمو دووەمیـان سـەرکەوتوو نـەبوون. بـەڵام سـێیەکەی دی لـە هـەموو جیهانـدا سـەرکەوتنیان وەدەسـتهێنا. فیلمـەکان بـریتی بـوون لـە: مێگـەل**، دژمـن، رێگـە، فیلمـی رێگـە "یـۆڵ" لـە هـەموویان نـزیکترە لـە خـودی منـەوە. بـە خـۆم بەشـداریم لـە هـەموو ئەرکـەکانی دەرهێنانیدا کردووە، ئێستا کەرەستەی دەرهێنانی زیاترم لەبەر دەستدایە، بەڵام لە تاراوگەدامو ئەگەر لە وڵاتو نیشتمانی خۆمدا ئەو فیلمانەم دەربکردایە، دەمتوانی شتی زۆر چاکتر پێشکەش بکەم...

((2))

## کارەکانی یەڵماز مایەی شانازی ئەهلی هونەرن

نەتـەوەی کـورد یەکێکـە لـە نەتـەوە هـەرە گـەورەکانی دنیـا, کـە تائێسـتا دەوڵـەتێکی سیاسـی نەتـەوەیی ئـیعتراف پێکـراوو یاسـایی کـۆی نەکردۆتـەوە, بەمـەش تاڕادەیـەکی زۆر کەوتۆتـە پـەراوێزی مێـژووەوەو رێگـەی نـەدراوە وەکـو پێویسـت بەشـداری لەبەرهـەمهێنانی مێـژووی ناوچەکەو مێژووی تیرەی بەشەڕدا بکات، کە ئەمە لە دوا ئەنجامدا زەرەرە بۆ مێـژووی هـەموو تیرەی بەشەر, بێگومان هەموو رێگەیەك بۆ بەگڕاچوونەوەو بەربەرەکانی ئەم نەتەوەیە گیراوەتە بەر، بۆیە خەڵکی کورد هەقی خۆیەتی هەر رێگەیەکی بەرەڤانی لە بوونی بەشەریو سیاسیو رۆشنبیرییو کۆمەڵایەتیو ئابووریو مێژوویيو جوگرافیایی خۆی بگرێتە بەر،و شارستانیانەو واقیعبینانە مامەڵەی لە تەکدا بکاتو لەناو جەرگەی مێژوودا دەوری خۆی بدینێو هەرگیز بەوە قاییل نەبێ بخرێتە دەرێی بازنەی مێژوو یان لە پەراوێزان بخرێ, یەکێك لەو رێگایانە هونەری سینەمایە، کەیەکێك لە کۆڵەکە بنەڕەتییەکانی خەباتی هەر گەلێك بۆ گەیشتن بە مافە رەواکانی خۆی، پێکدێنێ. هەر چەندە کوردەواری زەمینەیەکی یەجگار بە پیتو دەوڵەمەندە بۆ هونەری سینەما، کەچی دەبینین لە چاوخۆیا، چ لەلایەن هونەرکارانی کوردو چ لەلایەن هونەرکارانی بێگانـەوە تـەواو فـەرامۆش کـراوەو بزاڤـی ئـەم نەتـەوە هـەرە دێرینـە بـە بێدەنگییـەکی دژوار سپێردراوە. راستە لەو ساڵانەی دواییدا هەندێ هەوڵ لەو بوارەدا چ لەلایەن هونەرکارانی کوردو چ لەلایەن هونەرکارانی بێگانەوە بەدی دەکرێن، بەڵام وێڕای بایەخی مێژوویيو کاریگەری هونەری ئەو هەوڵانە، هێشتاش زۆر کەمنو زۆر درەنگ سەریان هەڵدا، ئەگەرچی هونەری رەسەن زۆرجار رێگاکان تەواو قەدبڕ دەکاتو زۆر خێرا دڕ بە تاریکییەکان دەداتو مەسەلەکان لە

فەرامۆشخانە سیاسییەکان دەرباز دەکات و دەردێنێ. بە هەرحاڵ هونەری سینەما یەکێکە لە ڕێگەو شێوازە هەرە شارستانییەکانی بەرەڤانی و بۆ گەلی بندەست لە نان و ئاو فەرزترە.
هەڵبەتە دیارترین کار لە بواری هونەری سینەمای کوردیدا، کارەکانی یەڵماز گۆنایە، کە بە ئیعتراف خەڵکانی شارەزاو پسپۆر لە بواری سینەمادا، نەك هەر مایەی شانازی کوردن و لەو مەیدانەدا سەرچاوەی نەگۆڕی زانیاری باوەڕپێکراون لەسەر وەزع و حاڵی کورد، بەڵکو مایەی شانازی دادپەروەران و خێرخوازان و چاکەخوازانی هەموو تیرەی بەشەرە. ڕۆڵەی میللەتی مەزڵوم بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ واقیعدا، دەبێ ئامرازی هەمە جۆری هەبێ و بە پێی دەرفەت و گونجان، گونجاوترین و کاریگەرترین ئامراز بەکار بێنێ. یەڵماز گۆنای, یەکێکە لەو کەسانەی بە جوانی ئەو کارەی کردووەو هەموو بوارەکانی ڕۆژنامەوانی، چیرۆکنووسی، ڕۆماننووسی و سیناریۆو فیلم و پاشان نواندن و دەرهێنانی جەربانددووەو هەموو ئامرازەکانیشی ئامرازی شارستانیانەی پەسەند بوون.
یەڵماز گۆنای، لە نێو زینداندا باشترین فیلمی خۆی نووسیوەو دەرهێناوە، دیارە ئەمەش کردوویەتی کارێك کە نەتوانێ سینەمایەکی کوردی بە هەموو خەسڵەتێکی کوردانەوە دابمەزرێنێ، وەکو هەر داهێنەرێکی دیکەی ناو زیندانی تورکیا ناچار بووە بە زمانی داگیرکەرەکەی بنووسێت نەك بە زمانی زگماکی خۆی. دیارە ئەمەش نیشانەیەکی هەرە زەق و دیاری مەزڵومیەتی مرۆڤی کوردە لەو وڵاتەدا. بەڵام ڕێگە لە بەهرە ناگیرێ، بەهرە کە پەنگی خواردەوە ئیدی بە هەر ئەوزارێك بێ گوزارشت لە خۆی دەکات. بۆیە کە سەیری کارەکانی گونای دەکەی دەبینی بە توانایەکی زۆر گەورەوە زمانی بەڵگەنامەو دیکۆمێنتی ئاوێتەی زمانی خەیاڵ کردووەو هونەری ڕەسەنی لەسەر ڕۆناوە، قەرەبووی زمانی کوردی بە زمانانی هونەری دیکەی وەکو زمانی مۆسیقا، زمانی نیگاو زمانی دیمەن و وێنە، کردۆتەوە. بۆ وێنە بێریڤان لە فیلمی مێگەلدا تاقە وشەیەکی لە دەم دەرنایەت، بە نیگاو ڕوانین بینەر دەدوێنێ و باسی واقیعی ئافرەتی کوردی بۆ دەکات. لە فیلمی ڕێگادا محەمەدۆ لە ڕێگەی مۆسیقاوە، دەربەدەری و ئاوارەیی و کول و کۆڤان و سۆزی کوردان دەگێڕێتەوە. لە فیلمی (سنووردا) وێنەی سنوورەکان، واتە وێنە، بە دوور لە هەر وشەیەکی ڕاستەوخۆ، دابەشکردنی بە ناهەقی کوردستان دەگێڕێتەوە, وا دیارە یەڵماز گونای هەرگیز ئەو دەرفەتەی بۆ نەڕەخساوە بەخششی خالیسەی نەتەوەیی پەتی، بە تایبەتی لە واری زماندا، پێشکەش بە نەتەوەکەی خۆی بکات، بەڵام بە جوانترین شێوە ئەو دەرفەتانەی قۆستوونەتەوە کە بۆی هەڵکەوتوون.
کە مستەفا کەمال هاتە سەر حوکم، ئیدی تورکیا بە جارێ کرا بە دۆزەخ، بە تایبەتی بۆ گەلانی غەیرە تورك، سیاسەتی تواندنەوەی ئەو گەلانە لە بۆتە تورك و تورکچێتیدا زۆر بە زەقی و بێ شەرمانە پەیڕەو دەکراو هزرڤانانی ڕەگەزپەرست بانگەشەیان بۆ زەینیەتی تۆرانچێتی دەکردو بە تۆبزی ناسنامەی تورکییان بەسەر خەڵکیدا دەسەپاند.
بۆیە ڕۆڵەکانی میللەتانی بندەست هەموو ڕێگەیەکیان بۆ بەرەڤانی لە بوونی خۆ دەگرتە بەر. یەڵماز گۆنای ڕۆڵەی میللەتی بندەستی کورد یەکێك بوو لەو کەسانەی زۆر ڕێگەی داهێناو

گرتەبەر. یەکێك لەو ڕێگەیانە، هونەری سینەما بوو. گۆنای ئەو شێوازەی گرتەبەر، بینەرو تەماشاڤان و خوێنەری لە ناخەوە دەهاڕوژان، قارەمانێکی پێ نیشان دەدا کە لە زۆر ڕووەوە تەواو لە خۆی بچێ، واتە وەرگر خۆی تێدا دەبینی و دەخوێندەوە، هەڵوێستی وەردەگرت. واتە گۆنای دەیویست هونەریانە بیرو هزرکرنی خەڵك بگۆڕێ، لە خەوی جەهالەت بێداریان بکاتەوەو چۆنییەتی بەرگری و بەرەڤانیان فێر بکات و هێڤی و ئاواتیان بخاتە دڵ و دەروون.

هونەرو ئەدەبیات، زادەو بەرەنجامی پێداویستییە روحی و دەروونییەکانی تیرەی بەشەرەو تا تیرەی بەشەر بمێنێ، ئەویش دەمێنێ، رەنگە لە رووی شێوازو بەرجەستەکردنەوە، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە یان لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە بگۆڕێ، بۆیە جیهانی هونەرو ئەدەبیات، و کارکردن لەو بوارانەدا هەمیشە پەسند بووەوە کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەبووەو مرۆڤی بەوە پەروەردەکردووە کە بە هیچ جۆرە خەسینێك قاییل نەبێ و نە بە تەماح وەبەرنان و نە بە هەڕەشەو چاولێ سوورکردنەوە دەستەمۆ نەبێ، بە هیچ نرخێ دەستبەرداری مرۆڤانی و کەرامەتی مرۆڤانی خۆی نەبێ, یەڵماز گۆنای لەم پێودانگەوە، بە ناو دنیای هونەرو ئەدەبیات کەوتووەو سەر لەبەری ئەو دنیایانەی خۆش ویستووەو لە ئەنجامدا لە دنیای هونەری سینەمادا گیرساوەتەوە، چونکە سینەما بۆ خۆی هونەرێکی ئاوێتەی فرە سەرچاوەیەو زادەی ئاوێتە بوونی ئۆرگانیکی کۆمەڵە هونەرێکی هەمە جۆری وەکو: نووسین، وێنە، مۆسیقا، شیعرو نواندن و دەرهێنانە... جا هەر ئەمەش کارێکی وەهای کردووە کە هونەری سینەما کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر فراوانترین بەرەی جەماوەری خەڵکەوە هەبێ و پایەیەکی بەرز لە دنیای هونەردا وەربگرێ و ببێ بە یەکێك لە هونەرە هەرە پێویستەکان بە تایبەتی بۆ گەلی مەزڵوومو بندەست.

جا هونەری سینەما بەو حەساوەی بە ئاسانی و لە ڕێگەی دیتنەوە دەگاتە فراوانترین بەرەی جەماوەری خەڵك, بۆیە دەکرێت هۆیەکی زۆر کاریگەر بێ بۆ پەروەردەکردنی تەماشاڤانان لە واری بیروباوەڕ و بەها کۆمەڵایەتی و ئەستاتیکی و روحییەکانەوە.

هەر چەندە پۆلێن کردنی هونەر هەندێ ناساز دێتە بەرچاو بەڵام هەندێ جار زەرورەتی باس, ناچارت دەکات مل بۆ ئەو کارە بدەیت. جا سەبارەت بە سینەما لە رۆژگاری ئەوڕۆدا، شارەزایان بەسەر چوار بەشی سەرەکیدا دابەشیان کردووە: یەکەم: فیلمی رۆمانەوانی (درێژ)، دووەم: فیلمی وێنەی جوڵەدار، سێیەم: فیلمی زانستی سادەکراو، چوارەم: فیلمی دیکۆمێنتی (تۆمارکراو) کە بە جۆرە ئەدەبێکی کۆمەڵایەتی مەجازی تایبەت دەژمێردرێ و لەسەر شریتی سینەمایی تۆمار دەکرێت و بانگەشە بۆ زانیاریانی زانستی دەکات، یان ژیانی روحی و کۆمەڵایەتی- سیاسی خەڵکی هونەریانە دەنوێنێ و بەرجەستە دەکات. جا بەم پێیە کاریگەری سینەمای دیکۆمێنتی لەسەر هەموو وارەکانی ژیانی خەڵکی بە دەردەکەوێ، دیارە دەورێکی زۆریش لە پەرەسەندن و خەملاندن و ناساندنی بزاڤی رزگاریخوازی میللەتانی بندەستیش دەبینێ.

تاكو رۆژی ئەمڕۆش مەسەلەی نەتەوەیی، یەكێكە لەو گرفتانەی لە زۆر شوێندا، بە تایبەتی لە رۆژهەڵاتی ناڤین، رووبەڕووی تیرەی بەشەر دەبێتەوەو پێویستی بە چارەسەری لۆژیكی و واقیعی هەیە، دەنا ئاكامی باشی نابێت.

مەسەلەی نەتەوەیی كورد، كە یەكێكە لە نەتەوە هەرە كۆنەكانی رۆژهەڵاتی ناڤین و گەورەترین نەتەوەی بێ دەوڵەتە، تا ئێستا چارەسەر نەكراوەو هاوسەنگی سیاسی ئەم دەڤەرەی پێوەسەنگەلا بووە. هەر چەندە هەوڵی یەجگار زۆر بۆ كۆیلاندنی ئەم گەلە تێكۆشەرە دراوە، لە مافە نەتەوەیی و رۆشنبیریی و ئابووری و كۆمەڵایەتی و دیموكراتییەكان بێبەش كراوە،. هەوڵدراوە هۆشیاریی نەتەوەیی لەلا بسڕدرێتەوە، زمانی زگماكی خۆی لە زۆر شوێندا لێ قەدەغە كراوە. كەچی بە هەر نرخێ بووە ناسنامەی رۆشنبیری و زمانی نەتەوەیی و كەلەپورو داب و نەریتی خۆی پاراستووە، بەرگری لە خاكی خۆی كردووە، لە سەدەی هەژدەوە تاكو رۆژگاری ئەمڕۆ پتر لە 25 شۆڕش و راپەڕین و بەرخودان لە پارچە بە ناهەق جیاكراوەكانی كوردستاندا بەرپا بووە، ئەگەرچی ئەو راپەڕینانە ئەنجامێكی ئەوتۆیان نەبووە، هەڵبەتە لەبەر زۆر هۆی خۆیی و بابەتی، لەوانە پێكهاتەی كۆمەڵگەی كوردەواری و بەرژەوەندییە نێو دەوڵەتییەكان لە دەڤەرەكەدا. بەڵام نەتەوەی كورد بەم حاڵەشەوە هەر تەسلیم نەبووەو كۆیلایەتی بە چارەنووسی خۆی نەزانیوەو سوور بووە لەسەر خەبات و بەرەڤانی و چەكی فڕێ نەداوەو بەپێی قۆناغ و سەردەم شێوازو رێگەی مقاوەمەتی تازەی داهێناوەو خەریكە دەبێتە مایەی سەرنج و بایەخی رای گشتی لە ناوچەكەو لە هەموو جیهاندا.

هەڵبەتە هونەری سینەما، بە تایبەتی سینەمای دیكومێنتی، نەك هەر گرنگە بۆ ناساندنی رابردوو و ئێستای گەلی كورد، رۆشنبیری و مێژووی كورد، خەباتی رزگاریخوازی كورد، بەڵكو یەكێكە لەو چەكە كارایانەی دەتوانێ بە پشتیوانی هەقیقەتی واقیعی، رەوایی دۆزی كورد بە هەموو دنیا بناسێنێ و بسەلمێنێ. جا یەڵماز گۆنای دەرهێنەرو رۆماننووس و سیناریۆنووس، ئەگەرچی كارەكانی بە زمانی كوردی ئەنجام نەداوە، هەوڵێكی زۆری داوە كە ژیانی واقیعی نەتەوەی كورد لە سایەی زوڵم و زۆری رژێمی توركیدا راستگۆیانە بخاتە روو، و جێ دەستی لەو بوارەدا زۆر دیارەو كارەكانی مایەی شانازی گەلی كوردن و بەخۆیشی وەكو هونەرمەندێكی رەسەن و شۆڕشگێڕ لە ریزی هەرە پێشەوەیە.

((3))

## (( ئازادی بەبێ مرۆڤ بەرجەستە نابێ ))

مرۆڤ بەبێ ئازادی هەڵناكات و ئازادیش بەبێ مرۆڤ بەرجەستە نابێ، بۆیە كە ئازادی لە مرۆڤ دەسەنرێتەوە، هەموو رێگەیەك دەگرێتە بەر بۆ وەرگرتنەوەی ئازادی خۆی و ئامادەیە گیانی خۆی لەو رێگەیەدا بەخت بكات... ئەوەتا لەم سەردەمانەدا پانتایی خەباتی رزگاریخوازی گەلانی بن دەست یەجگار بەرین بووەو شێوازی هەمەجۆر بۆ ئەو مەبەستە داهێنراوە... یەكێك لەو كەناڵانە هونەری سینەماو تەلەفزیۆنی دیكومێنتییە كە دەورێكی یەجگار باڵا دەبینێ لە

بەرجەستەکردنو تەنانەت ئاراستەکردنی ئەو پەرەسەندنو گۆڕانکارییە خێرایانەی بەسەر کۆمەڵدا دێ. فیلمی دیکۆمێنتی سەرکەوتوو و راستگۆ هەوڵدەدات نەخشەی شارستانیەتی جیهان بە هەموو لایەنو رەنگو روو و لقو پۆپەکانییەوە رەسم بکاتو، دەرفەت بخاتە بەردەم مرۆڤ تا پەیوەندییەکانی خۆی بەم دنیایەوە دیاری بکاتو شوێنو دەوری خۆی بزانێو بناسێت تا مومارەسەی بکات. جا فیلمی دیکۆمێنتی بە حوکمی ئەوەی لایەنێکی بانگەشەیی زۆر کاریگەری تێدایە، دەتوانێ دەورێکی یەجگار کاریگەر لە پەروەردەکردنو رۆشنبیراندنی جەماوەری خەڵك لە هەموو بوارە سیاسیو کۆمەڵایەتیو مەعنەوییەکانەوە ببینێ.

هەڵبەتە سینەمای دیکۆمێنتی، پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی وەکو سیاسەتو ئایدیۆلۆژیاو بانگەشەوە هەیە، واتە شتێکە لە نێوان هونەرو رۆژنامەوانیدا، کە هەردووکیان ئەوزاری گۆڕینو گۆڕانن واتە ئەگەر فیلمێکی دیکۆمێنتی لەسەر بناغەی رووداوێن راستەقینەو بەڵگەنامەی راستو دروست رۆبنرێ، ئەوا دەورێکی یەجگار گەورە لە خولقاندنی روحیەتی شۆڕشگێڕانە لەلای جەماوەری خەڵکی دەبینیو بەشداری لە ریشاژۆکردنی خەباتو تێکۆشانیاندا دەکاتو بەگەڵ کاروانی گۆڕانو گۆڕینیان دەخاتو هانیان دەدات کە بە هیچ چەوسانەوەیەك یان ملکەچیو دەستەمۆ بوونێك رازی نەبن.

هەڵبەتە هونەری راستەقینەو رەسەن، ئەوەیە بتکات بە هاوڕێی گیانی بە گیانی خۆشیو ناخۆشی خەڵکی، بە تایبەتی هونەری سینەمای دیکۆمێنتی بە حوکمی ئەوەی توانایەکی زۆر گەورەی هەیە کە بە زمانێکی بینایی رەوانو مەجازی جوان باسی گرفتە هەنووکەییەکانی سەردەم بکات، پێویستە خەمو گرفتەکانی مرۆڤ بهونەرێنێو چارەسەری بۆ بدۆزێتەوەو ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵكو دابو نەریتە نەتەوەییەکان بەرجەستە بکاتو خەڵکی بخاتە سەر راستە رێگەی بیرکردنەوە، تا لە نزیکەوەو راستەوخۆ بەشداری پرۆسەی گۆڕانو گۆڕین بکاتو خەسینی مادیو مەعنەوی رەفز بکات.

ئەگەر سەرنجێکی خێرای کارە هونەرییەکانی یەڵماز گۆنای بدەین، دەبینین کۆمەڵە نموونەیەکی زندووی سینەمای جدینو زۆر دۆزی مرۆڤانی گەورەیان لە خۆ گرتووەو بە ئاشکرا هەوڵو تەقەلای ئەم تاقمو دارو دەستەو رژێمانە ریسوا دەکات کە هەولی کۆیلاندنی گەلانو سەرکوتکاریو سڕینەوەی بەها مرۆڤانییەکان دەدەنو زەبرو زەنگو تیرۆرو تۆقاندن برەو پێدەدەن.

هەڵبەتە فیلمی دیکۆمێنتی، ئەگەر هونەریانە مۆنتاج بکرێ، و بە زەبری مۆنتاجی دروست کارێکی هونەری تازەی لێ بخولقێنرێ ئەوا دەبێ بە بەڵگەنامەیەکی هونەری ئاوس بە ناوەڕۆکێن سیاسیو کۆمەڵایەتی یەجگار دیارو کاریگەر، بۆ نموونەئەو فیلمانەی سەبارەت بە فاشیزمو دژایەتی فاشیزم بەرهەم هاتوون، بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەم لاوە، سامانێکی یەجگار گەورە پێك دێنن لە مێژووی سینەمای دیکۆمێنتیو تەلەفزیۆندا. دیارە بایەخی ئەو جۆرە فیلمە زیاتر لەوەدایە کە تاوانەکانی فاشیزم وەبیر جیهان دێنێتەوەو لە کارەساتو ئاکامە مەترسیدارەکانی ئاگاداریان دەکاتەوە.

هەڵبەتە فیلمی درێژو ڕۆمانەوانیش دەوری یەجگار گەورەی لە ریسواکردنو لە قاودانی تاوانەکانی فاشیزمدا دیتووەو خەڵکیان دژی جەنگ هانداوە.. مایەی شانازییە کە کارەکانی یەڵماز گۆنای، شوێنی تایبەتیان لەو بوارەدا هەیەو شان بەشانی بزاڤی سینەمای دنیا بەشدارییان لە گەڵاڵە کردنی رابوونی هێزە دیموکراسییەکان لە زۆر وڵاتانی جیهاندا، کردووە.

دیارە زۆربەی هەرە زۆری ئەو فیلمە دیکۆمێنتییانەی بۆ دژایەتی فاشیزم بەرهەم هاتوون یان تەرخان کراون شەقڵو مۆرکی تایبەتیو جیاوازی خۆیان هەیە. هەر یەکێکیان شەقڵی ئەو سەردەمەی پێوەیە کە تیایدا بەرهەم هاتووە، تایبەتمەندی ئەزموونی مێژوویيو شەقڵی خەباتی رزگاریخوازی هەر گەلێك لەو گەلانەی پێوە دیارە کە بوون بە بابەتی فیلمەکە. هەڵبەتە بابەتی خەبتین لە ڕای ئاشتی جیهانیدا، بابەتێکی هەرە سەرەکی ئەو فیلمە دیکۆمێنتیانەیە، بە هەر حاڵ کامیرای سینەمایی ئەمڕۆکە بووە بە چەکێکی کاریگەر لە خەباتی رزگاری نەتەوەییدا، کە ئەمە لە ناوەڕۆکی پێشکەوتوخوازی شۆڕشگێڕانەی دژ بە فاشیزمو جەنگو سەرکوتکاری بەدەرنییە.

هەر فیلمێکی دیکۆمێنتی بگری دنیایەك توانای هزریو بەهای ئەستاتیکی تێدایەو، بەڵگەو بەڵگەنامە لە رۆژگاری ئەمڕۆکەدا، بە جۆرێ تێکەڵ بە ژیان بووە، مرۆڤ ناتوانێ دەستبەرداری بێ، خۆ ئەگەر ئەو بەڵگەنامانە بە راستگۆیی بهونەرێنرێن ئەوا کاریگەرییەکەیان زۆر زیاتر دەبێ، و مرۆڤ دەتوانێ رووداوو دیاردە ناوچەييو جیهانییەکان هەڵسەنگێنێ، پێگەی خۆی لە ناو ژیاندا بناسێو هەڵوێست بنوێنێو بەرگری لێ بکات.

بە هەر حاڵ بەم پێیە فیلمی دیکۆمێنتی بۆ خۆی دەبێ بە شایەت بەسەر ژیانەوە، دەبێ بەسەرچاوەی بڕواو متمانەی خەڵکیو دەبێ بەشەریکی ژیانی رۆژانەی خەڵکیو، شان بەشانی جەماوەرو هونەریانە لە ڕای ئاشتیو ئازادی گەلاندا تێدەکۆشێت. هەڵبەتە بەڵگەنامە گەلێك تایبەتمەندی لە خۆ دەگرێ لەوانە فرە واتایی، کورتبڕی، ناوەڕۆکی چڕوپڕ، شەرحو شرۆڤەی ئاسانو راستەوخۆو دیاردەو رووداوەکان، نیشاندانی ئاڵۆزییەکانی سەردەمو بەرجەستەکردنی وەرچەرخانە مێژووییەکانی چارەنووسی خەڵکانی قەرارسازو دنیا...

بە هەرحاڵ دیکۆمێنتیەت ئەمڕۆکە بە تەواوی هاتۆتە ناو ژیانی رۆژانەی گەلانەوەو پێویستە وەکو چەکێکی شارستانیانەی هەمە پەسەندو وەکو شایەتێکی هەرە باوەڕ پێکراو بخرێتە خزمەتی بزاڤی رزگاریخوازی گەلانی بندەستو چەسپاندنی ئاشتی جیهانییەوە.

((4))

## (( دەوڵەتی نەتەوەیی ))

یەکێك لەو مەسەلە ئاڵۆزانەی کە هەندێ وڵاتانی دنیا پێوەی گیرۆدە بووە، مەسەلەی نەتەوەییە، کە بێگومان ئەم مەسەلەیە کار دەکاتە سەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتيو رەوتو ئاراستەی پرۆسەی سیاسی لە وڵاتانی فرەنەتەوەدا، دیارە چارەسەر نەکردنی عادیلانەی دیموکراسیانەی ئەو مەسەلەیە زۆر جار پێکادانو توندوتیژی لێدەکەوێتەوەو بارودۆخە سیاسییەکان ئاڵۆز دەکات. مەسەلەی نەتەوەیی کورد لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا، کە گەورەترین گەلی دنیایەو تا ئێستا بە ماڤ

چارەنووسی خۆی، واتە دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆ نەگەییوە، باری سیاسی ناوچەکەی ئاڵۆزاندووە،و ئەمەش خۆی لە خۆیدا زەنگێکە بۆ داگیرکەرانی کورد، کە ئەوزاری بیرکردنەوەو کردارییان سەبارەت بەو مەسەلەیە بگۆڕن‌و بە زووترین کات لەگەڵ کوردا بکەونە دیالۆگ‌و مل بۆ خواستە رەواکانی گەلی کورد بدەن‌و بەشارستانیانەترین شێواز ئەو مەسەلەیە چارەسەر بکەن.

دیارە رژێمانی داگیرکەری کورد دەبێ بەر لە هەموو شتێك دان بەوەدا بنەن کە کورد گەلێکی سەربەخۆیە، یەکێکە لە گەلە رەسەن‌و دێرینەکانی دەڤەرەکە، تایبەتمەندی ئەتنی خۆیان هەیە، زمان‌و خاکی یەکگرتوویان هەیەو لە پێش زایینەوە ناویان لە مێژوودا هاتووەو بەشداری کاریگەریان لە هەموو رووداوە سیاسی‌و سوپایی‌و رۆشنبیرییەکانی ناوچەکەدا کردووەو کەڵە پیاوی گەورەیان لەو بوارانەدا تیا هەڵکەوتووەو لە سەدەی دوازدەیەمی زایینیەوە بە وڵاتەکەیان گوتراوە کوردستان، کە پانتاییەکەی نزیکەی 450 هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبێ. یەکەم جار لە 23 ئابی 1514دا واتە پاش جەنگی چاڵدێران، کوردستان لە نێوان ئێرانی سەفەوییانی شیعە مەزەب‌و عوسمانیانی سوننە مەزەب لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا دابەش کرداو ئەو دابەشکردنە لە ساڵی 1639 بەپێی رێکەوتننامەی قەسری شیرین، لە نێوان شا عەباسی سەفەوی‌و سوڵتان مرادی چوارەمی تورکیدا قەراری تەواوەتی لەسەر درا. پاشان وڵاتی کوردستان بۆ جاری دووەم، بەپێی پەیماننامەی سایکس بیکۆ 1916 دابەش کرایەوەو بوو بە چوار بەشەوەو وڵاتانی تورکیاو ئێران‌و عێراق‌و سوریا بەو شێوەیەی ئێستایان لەسەر حەساوی دەوڵەت‌و وڵاتی کوردستان دامەزران..

هەڵبەتە نەتەوەی کورد لە یەکەم دابەشکردنی وڵاتەکەیانەوە تاکو رۆژگاری ئەمرۆ پەرچەکرداری خۆی هەبووە، خەباتی کردووە، میرنشینانی دامەزراندووە، شۆڕشی بەرپا کردووە، سوور بووە لەسەر مان‌و ژیان‌و یەکگرتنەوەی گەل‌و وڵاتی خۆی، ئەگەرچی بە ئامانجەکانی خۆی نەگەییوە، بەڵام هەر کۆڵی نەداوەو ناسنامەی نەتەوەیی خۆی پاراستووەو ئامادە بووە لە پێناوی یەکگرتنەوەو خۆیبوونی گەل‌و وڵاتدا هەر قوربانییەك چەند گەورەش بێ بیدات. دیارە ئەم مەسەلەیە لە گۆرانی میللی‌و ئەدەبیاتی فۆلکلۆری‌و پەندی پێشینان‌و سەراپای کەلەپووری رۆشنبیریدا رەنگی داوەتەوەو سەنگەرێك بووە بۆ بەرەڤانی لەو دۆزە رەوایەو ئەمەش هەر لە سنووری وشەدا نەماوەتەوەو بەرەبەرە زەمینەی بۆ هونەری سینەماش خۆشکردووە. هەڵبەتە کورد لەبەر ئەوەی دەوڵەتی سەربەخۆی ئیعتراف پێ کراوی نییە، هەر پارچەیەکی بە تۆبزی‌و بێ ویستی گەلی کورد لکێنراوە بە دەوڵەتێکەوە. دیارە میللەتێك کە دەوڵەتی نەبوو تا بە ئەزموونی خۆی مومارەسەی ژیانی تێدا بکات‌و لە قووڵایی ژیانەوە بەشداری لەبەرهەمهێنانی مێژووی تیرەی بەشەردا بکات، ئەوا ناچارە دەوڵەتی بەدیل، چ مادی و چ مەعنەوی بۆ خۆی دابین بکات، کورد بۆ پاراستنی ناسنامەی نەتەوەیی خۆی پەنای وەبەر چالاکی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و هونەری بردووە، بەپێی دەرفەت چ بە ئاشکرا بوو بێ چ بە نهێنی، چ بە زمانی کوردی بوو بێ چ بە زمانی داگیرکەرەکەی ئەو چالاکیانەی ئەنجام داوە، بۆیە هەر سەرکەوتنێك

لەو بوارانەدا، لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا بەدی هاتبیٚ سەرکەوتن بووە بۆ کوردی پارچەکانی دیکەش، ئەگەرچی لە باری فەرمییەوە دەچێتە خانەی چالاکی و سەرکەوتنی دەوڵەتی داگیرکەرەوە.

بە هەر حاڵ وتمان کەلەپووری رۆشنبیری کوردی بە هەموو لق و پۆپەکانییەوە، بەرەبەرە زەمینەی بۆ سەر هەڵدانی هونەری سینەمای دیکۆمێنتی خۆش کردووە. سینەماکاری باش لە کوردا هەڵکەوتوون، بەڵام مەخابن کەمتر خۆیان بە سینەمای کوردییەوە خەریك کردووە، دیارە ئەمەش هۆکاری زۆری هەیە، بە تایبەتی هۆکارو کۆسپی سیاسی. چونکە کوردو کوردستان دوو زاراوەی سیاسی قەدەغەن و سەریەشەی گەورە دروست دەکەن! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانێك هەن و هەبوون بەوپەری جورئەتەوەو بە بەهای ژیان خۆیان لەو قەدەغەیە داوەو رچەکەیان شکاندووە. لیٚ مەخابن ژمارەیان زۆر کەمە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا پلەی پێشەنگییان پێدەبەخشێت و ئەوەندەی ئەم نووسینە دەرفەت بدات. هەڵوەستەیان لەسەر دەکەین، بۆ نموونە یەکێك لەوانە قادری نورییە کە لە کۆلیژی وێنەگرتنی سەر بە پەیمانگای سینەمای یەکێتیی سۆڤیەتی جاراندا خوێندنی تەواو کردووە، ئەم پیاوە لە حەفتایەکانی سەدەی بیستەمدا هەندیٚ کورتە فیلمی لەمەڕ جەژنە نەتەوەییەکانی کوردانی کوردستانی عێراقدا وێنەگرتووە.

قادر نوری لە ساڵی 1982دا فیلمێکی دیکۆمێنتی درێژی دەربارەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی بەرهەمهێناوە بە ناوی (کوردستان لە ئاگر)دا. ئەم کارە بە فیلمی مۆنتاج دەژمێردریٚ.

چونکە لە دەرهێنانیدا، پشتی بە گرتەو دیمەنی کۆمەڵێك فیلمی ئەوروپایی لەسەر بزاڤی کوردی و، هەندیٚ دیمەنی فیلمی دیکۆمێنتی (ئێمە کوردین) بەستووە. یانی لە چەند فیلمێکی جیاوازەوە گرتەو دیمەنی وێنەگیراوی وەرگرتووەو مۆنتاجی کردوون و فیلمێکی تازەی لیٚ دروست کردووە. ئامانجی سەرەکی فیلمەکە نیشاندانی ژیانی رۆژانەی کورد بووە لە تورکیا و ئێران و عێراق و سۆڤیەتی جاراندا.

یەکێك لە باشییەکانی ئەم فیلمە ئەوەیە کە بۆ یەکەمجار فیلمێکی دیکۆمێنتی مۆنتاجکراو دەربارەی کورد، لە روانگەی کوردێکەوە بۆ دۆزی گەلەکەی بەرهەم دەهێنریٚ. (لە یەك خێزاندا) فیلمێکی دیکەی دیکۆمێنتییە دەربارەی کورد کە لەلایەن دکتۆر ئیبراهیم مەحموودەوە دەرهێنراوە. دکتۆر بەخۆی ئەم فیلمە بە کارێکی پیشەیی نازانیٚ، چونکە وەکو کارێکی هونەری، لەلایەن رۆژنامەنووسێکەوە دەرهێنراوە، بەمەبەستی وەرگرتنی کارنامەی ماجستێر لە بواری رۆژنامەوانی تەلەفزیۆنیدا، لە ساڵی 1985. ئەم فیلمە رەنگینەو ماوەکەی 25 دەقیقەیە، لە 3 بەشی سەرەکی پێك هاتووە، مەبەستی سەرەکی فیلمەکە نیشاندانی واقیعی گەلی کوردە لە کۆماری ئەرمینیاو، چارەسەری سوسیالیستانەی مەسەلەی نەتەوەیی و، ئاماژەشە بۆ مێژووی مەسەلەی نەتەوەیی گەلی کورد بە شێوەیەکی گشتی. بەشی یەکەمی فیلمەکە دیمانەیەکی رۆژنامەوانییە لەگەڵ لازاریفدا کە زانایەکی گەورەو پسپۆرێکی بەتوانایە لە بواری کوردۆلۆژیدا.

بەشی دووەم تەرخانکراوە بۆ باسی ژیانی کورد لە کۆماری ئەرمینیا… بەشی سێیەم تەرخانە بۆ جەژنی نەتەوەیی کورد، بۆ جەژنی نەورۆزو رێورەسمی بەرێوەچوونی ئەو جەژنە لەلایەن

خوێندکارانی کوردەوەو رەسەنایەتی گۆرانی و هەڵپەرکێی کوردیو چەمكو مانا سیاسییەکانی نەورۆز لەواری خەباتی هاوچەرخی گەلی کوردا بەرجەستە کراون. (پاشای ناحەزی شاشە) فیلمێکی دیکۆمێنتی درێژی دیکەیە، لەلایەن نیشتمانپەروەرانی کوردەوە بەرهەم هاتووەو بۆ یادی کەڵە دەرهێنەرو نووسەرو ئەکتەری کورد یەڵماز گۆنای تەرخانکراوە. ئەم فیلمە لەلایەن ئەنیستیتۆی کورد لە پاریسو بەیارمەتی تەلەفزیۆنی فەرەنسی T.V.A بەرهەم هاتووە.

یەڵماز گۆنای بەخۆی یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی ئەنیستیتۆی کورد لە ساڵی 1983. فیلمی (پاشای ناحەزی شاشە) دەچێتە خانەی فیلمێن – وێنە (واتە ئەو فیلمانەی کە ژیننامەی کەسێك دەگێڕنەوە.. لێ فیلمسازەکان زیرەکانە توانیان لە رێگەی بەکارهێنانی کەرەستە دیکۆمێنتییە زۆرو زەبەندەکانی ناو ئەرشیفی دەوڵەتی تورکیاوە، لە میانەی پیشاندانی ژیانی خانەوادەیی کەسێکی دیاریکراوەوە، ژیانی کارەسات ئامێزی سەرانسەری گەلێك نیشان بدەنو بەرجەستەی بکەن. فیلمسازەکان بە زەبری مۆنتاژکردنی سەرکەوتووانەی ئەرشیفی کۆن، توانیان جەلادان ریسوا بکەنو بینەر بە رادەی دڕندەگەری تورانیزم دژی خەڵکانی ئاشتی خوازی کوردستان لە تورکیادا، ئاشنا بکەن. واتە ئەو ئەرشیفەی دەوڵەتی تورکیا دژی خۆی بەکار هاتەوەو بینەر بوو بە شایەتی کۆچاندنی بە تۆبزیو نا مرۆڤانەی منداڵو ژنو و پیرەمێردی بێ تاوانو بێدەسەڵاتو، تەنانەت حەیواناتی بەستەزمانیش، لە چیاکانیانەوە بۆ ناوەندی ئەنادۆڵی غەریب بەکورد، هەروەها ئەم فیلمە زۆر بە روونی گرنگترین قۆناغی پەرەسەندنی ژیانی هونەری یەڵماز گۆنای دەخاتە روو. هەروەها ئەم فیلمە ئەو ساتە مێژوویانەش نیشان دەدات کە یەڵماز گۆنای لە شاشەوە باسی کارەساتی گەلەکەیو خەباتی رزگاریخوازی گەلەکەی دەکاتو ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ بۆ پشتیوانیکردن لە دۆزە رەواکەیو بەڵێن دەدات کە زۆر کاری سینەمایی بخاتە خزمەتی دۆزی نەتەوەیی کوردەوە، لێ مەخابن تەمەن مەودای نەدا حەزو ئارەزووەکانی جێبەجێ بکات. فیلمەکە بە نیشاندانی کاروانی بێ سەروبنی خەڵکی کۆتایی دێ کە جەنازەکەی گۆنای دەخەنە سەر شانو بۆ دوا ئارامگەی دەبەن.

## ((سینەما وەکو چەکێکی شارستانیانە))

بە هەر حاڵ سینەماش وەکو چەکێکی شارستانیانە، سەنگەرێکی دیکەی بەرەڤانییەو سینەماکارانی کورد هەستیان بە گرنگیو کاریگەری ئەو چەکە کردووەو کەم دابێژێك جەرباندوویانە, ژیانی کوردەواری بە گشتیو بزاڤی رزگاریخوازی کورد بە تایبەتی بووە بە کەرەستەو بابەتی ئەو هونەرە گەورەیەو تائێستا ژمارەیەك فیلمی دیکۆمێنتی لەو بارەیەوە بەرهەم هاتووە. بەڵام زۆربەی ئەو فیلمانە لەلایەن کۆمپانیا تەلەفزیۆنییە ئەوروپییەکانەوە بەرهەم هاتووەو ژمارەشیان رەنگە لە 20– 30 فیلمێك تێ نەپەڕێ.. هەر هەموویان راستەوخۆ مامەڵەیان لەگەڵ دۆزی کوردا کردووە، مەبەستی هەموو ئەو فیلمانە هاوسۆزی بووە لەگەڵ کوردو دۆزی کوردا، بەڵام چونکە فیلمسازەکان رۆژنامەنووسو سینەماکاری بێگانە بوون، نەیانتوانیوە وەکو پێویست گوزارشت لە نۆڕینی کوردو ئاراستەی بزاڤی کوردی بکەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو

فیلمانە تیشکیان خستۆتەسەر بزاڤی رزگاریخوازی کوردو بەڕای گشتی جیهانیان ناساندووەو کارەساتە یەك لە دوای یەکەکانی کوردیان بەرجەستە کردووە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ فیلمی ((دەنگی کوردستان)) بکرێ. ئەم کارە فیلمێکی تەلەفزیۆنی درێژی ئەڵمانییە، کە لە ساڵی 1984دا لەلایەن ئەنستیتۆی کورد- لە پاریس، دۆبلاژکراوە بۆ کوردی فیلمەکە رەش و سپییەو ماوەکەی 62 دەقیقەیە.

ئەم فیلمە کورتەیەکی مێژوویی کوردستان تا ساڵی 1976 هونەریانە دەنوێنێ, پشت بە کۆمەڵێك رووداوی وێنەگیراو لە مێژووی کوردەواری و کۆمەڵێکی تر لە وێنەو تابلۆو پۆستەری مێژوویی بەهادار دەبەستێ.

دیارە ئەم فیلمە لەسەر رێسای مۆنتاج رۆنراوە، لە سەرەتاوە ریزی پێشمەرگەمان نیشان دەدا کە بە چیاکاندا سەردەکەون، ئەوجا نەخشەی کوردستان لەسەر شاشە دەردەکەوێ، ئەوجا ژمارەیەك دیمەنی ژیانی پاشکەوتووی کورد لە سایەی داگیرکەری تورکیدا دەردەکەوێ، هەڵبەتە بە پشتیوانی کۆمەڵێك دیکۆمێنتی مێژوویی و پەیماننامەی نێو دەوڵەتی دەربارەی دۆزی کورد لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا. فیلم سازەکان جارێکی دی ئەوە دەسەلمێننەوە کە سەرکردایەتی دەوڵەتی تورکیای تازە بە سەرۆکایەتی مستەفا ئەتاتورك خیانەتیان لە کورد کردووەو لەگەڵ چەند دەوڵەتێکی ئەورووپاییدا پیلانیان لە کورد کردووەو بە پێچەوانەی وەعدو بەڵێنی خۆیان، کوردیان لە ماف نەتەوەیی و سەربەخۆیی مەحروم کردووە.

بە هەر حاڵ ئەم فیلمە یەکێکە لەو فیلمە دیکۆمێنتییە سیاسییە هەرە گرنگانەی کە بۆ دۆزی کورد تەرخان کراوە. زۆر بە روونی جەوهەرو کرۆکی دۆزی کوردی نیشاندەدات، فیلمەکە بارودۆخی کوردەواری لە چەند پارچەیەکی کوردستاندا بەرجەستە دەکات، لە کاتێکدا کە ئاماژە بۆ ناکامی و نسکۆهێنانی شۆڕشەکانی کورد لە پارچەکانی کوردستاندا دەکات، لە هەمان کاتدا ئەوە دووپات دەکاتەوە کە شۆڕش تا وەدی هاتنی ئازادی و ئاشتی لە خاکی کوردستاندا هەر بەردەوام دەبێ..

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ فیلمێکی دیکەش بکرێ کە بۆ خەبات و ژیانی کوردی ئێران تەرخان کراوە. ئەم کارە لەلایەن کۆمەڵە سینەماکارێکی هۆڵەندییەو وێنەگیراوە، ماوەکەی 35 دەقیقەیە. فیلمەکە مۆنتاجێکی یەجگار جوان کراوە. بونیادی فیلمەکەو زمانە سینەماییەکەی زۆر رۆمانسیانەو شاعیرانەیە. فیلمسازەکان زیرەکانە کامیراکانیان خستۆتە سەر پەرینەوەو کۆچبەران و پێشمەرگە کوردەکان لە کوردستانی ئێرانەوە بۆ کوردستانی عێراق، بەمەش تەکید لەسەر مەسەلەیەکی یەجگار گرنگ سەبارەت بە گەلی کورد دەکەن, ئەویش ئەوەیە کە کودستان یەك وڵاتە و ئەو سنورانەی ئێستا هەن, سنوری دەسکردن و ئیمپریالیزم دایناون..

(عیادەی دکتۆرە فەرەنسییەکە) فیلمێکی دیکەیە کە هەندێ رۆژنامەوانی فەرەنسی بە هاوکاری لەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا وێنەیان گرتووە. فلیمێکی دیکۆمێنتی کورتە, ماوەکەی شەش دەقیقەیە, رەنگینە, ئەو کارە خێرخوازییە پیشان دەدات کە دکتۆرێکی فەرەنسی بۆماوەیەکی درێژو لە هەلومەرجێکی دژواردا لە چیاکانی کوردستان و لە ناو هێزی پێشمەرگەدا

ئـەنجامی دەدات. لـە فیلمەکـەدا دکتۆرەکـە بـە گونـدو شارۆچـکەکانی کوردسـتاندا دەگـەڕیٚ بـۆ چارەسـەری برینـدارانی کـورد. ژیـانی سـەختو دژواری کـوردو پەریشـانیان بەدەسـت پاسـدارانی ئێرانەوە لە فیلمەکەدا بە جۆرێ بەرجەستە دەکرێ کە تەمەشاڤان خۆبەخۆ دەبێ بەشایەت بەسـەر کردەوە دڕندانەکانی رژێمی ئێرانی دژ بە گەلی کورد.

بەڵام فیلمی (هەڵەبجە، هێروشیمای دووەمە) گرنگترین و مێژووییترین فیلمە دەربارەی کورد، ئـەم فیلمە لەلایـەن وێنـەگرانی ئێرانییـەوە گیراوە، رەنگینـە، ماوەکـەی 25 دەقیقەیـە باسـی کارەسـاتی کیمیابارانی شاری هەڵەبجە لەلایەن حکومـەتی عێراقییـەوە، لـە ئـازاری 1988دا دەکـات. فیلمەکـە بە پیشاندانی هەندێ بابەتی ئەرشیفی دەربارەی کارەساتەکەی هێروشیما کە لـە سـاڵی 1946دا گیراوە دەست پێدەکاتو بـەیناو بـەین هەنـدێ دیمـەنی کارەسـاتی هەڵەبجـەی تێهـەڵکێش دەکـات، وەك ئەوەی بیەوێ بەراوردێك لە نێوان ئەو دوو کارەساتەی مێژووی مرۆڤایەتی بکات. پاش ئەوە کامیرا بە نێو دەشتی بەرینو سەوزی هەڵەبجەو شەقامە کپو ئارامەکانیو خەڵکە بـێ تاوانەکـەی بەر لە روودانی کارەساتەکە دەکەوێ. لەگەڵ ئەو دیمەنانەدا دەنگی بێژەر دێ کـە باسـی مێـژووی شارەکەو ژمارەی خەڵکەکەیو شێوازی ژیانی رۆژانەیان دەکات... ئەوجا لەپڕ دەنگێکی ترسـناك دێ کە بەرەبەرە زیاد دەکاتو دەبێ بە تەقینەوەیـەکی کوشـندە.. دوای تـۆزێ دووکـەڵێکی رەشو چڕی گـازی ژەهـراوی ئـەو شـارە سـەوزە دادەپۆشـێ، بزەی سـەر لێـوی خەڵکەکـە دەکـوژێ، هـاوار بـەرز دەبێتـەوە، خـەمو شـینو شـەپۆر هـەموو شـار دەگرێتـەوە... پاشـان بێدەنگییـەکی کوشـندە شاشەکە دادەپۆشێ. ئەوسا چرە دوکەڵە رەشەکە بەرە بەرە دەرەوێتـەوەو سـامناکی کارەسـاتەکە دەردەکـەوێ. جـەنازە لـە هـەموو شـوێنێ کـەوتووە، هەنـدێکیان بـە مردوویـەتی باوەشـیان بـە منداڵەکانیاندا کردووە. هەنـدێکی دی بـەدەم کارکردنـەوە مـردوون، قوتـابی بەکۆمـەڵ لـە یاریگـەی قوتابخانەکانو بەسەر کورسی ناو پۆلەکانیانەوە مردوون. ماڵەکان رووخاون، هاواری زندووەکان دەگاتە عەرشی عەزیم، لە چەند دەقیقەیەکدا هەزاران کورد بە بەرچاوی دنیاوە کوژران!.

بێگومان ئەم فیلمە شایەدییەکی هەرە زیندووە لەسـەر رەفتـاری تاوانکارانـەی رژێمـی عێـراق دژی گـەلی کـورد کـە بێگومـان داگیرکـەرەکانی تـری کوردسـتانیش درێغیـان نـەکردووە لـە جینوسـایدی کورد.

هــەروەها (کوردســتان لــە ســاڵانی 1977–1978 ) دا فیلمێکــی دیکــەی ئــەڵمانیای رۆژاوایــە. مەبەسـتی فیلمەکـە بریتییـە لـە ناسـاندنی بـارودۆخی گـەلی کـورد بـە کۆمەڵگـەی نێـو دەوڵـەتیو هاندانی بۆ هاوکاریو هاوسۆزی گـەلی کـورد. فیلمەکـە کورتـە، رەنگینـە، ماوەکـەی دە دەقیقەیـە. بابـەتی سـەرەکی فیلمەکـە بریتییـە لـە نیشـاندانی خۆپیشـاندانێکی گـەورەی پشـتیوانی لـە گـەلی کورد، لەبەردەم سەفارەتخانەی عێراق ی لە لەندەن، کـە خۆپیشـاندەران داوا لـە حکومـەتی عێـراق دەکـەن، دەسـتبەرداری چەوسـاندنەوەی گـەلی کـورد بـێ. فیلمسـازەکان بـە روونـیو زیرەکانـە هەوڵیانـداوە ئـەوە بسـەلمێنن کەمەسـەلەی کـورد، لـەوە دەرچـووە مەسـەلەیەکی نـاوخۆ بـێو چەوسێنەرانی کـورد نـاتوانن چیتر رای کۆمەڵگـەی جیهـانی بـەو بیـانووە لاوازانـە چەواشـە بکـەن،

مەسەلەی کورد تازە بووە بە مەسەلەیەکی نێو دەوڵەتی و ملیۆنان ئازادیخوازو ئاشتی پەروەری دنیا هاوسۆزی لەگەڵ دەکەن.

بە هەر حاڵ نەبوونی دەوڵەتی کوردی کاریگەری سەلبی بەسەر زۆر واری ژیانی کوردەوارییەوە هەبووەو هەیە، دیارە ئەم کاریگەرییە سەلبییە بواری هونەری سینەمای کوردیشی گرتۆتەوە، کە دەتوانێ بۆشایی زۆر گەورە لە بزاڤی رزگاریخوازی کورد پڕ بکاتەوە، بۆیە ناکرێ چیتر ئەو بوارە لەلایەن دەسەڵاتداران و کادرانی هونەریی کوردەوە فەرامۆش بکرێ، چونکە ئەوەی هونەری سینەما دەتوانێ بیڵێ و بیگەیەنێ، بە زۆر چەلەنگی و چالاکی دیکەی هونەری و سیاسی نایەتە گوتن و گەیاندن و سینەما بۆ ئێمەی کورد، رەنگە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆ لە هەموو هونەرەکانی دیکە گرنگترو لە پێشتربێ...

((5))

## ((کارە هونەرییەکانی گۆنای لە ریزی پێشەوەن))

هەڵبەتە کە باس بێتە سەر دۆزی نەتەوەیی کوردو بەرجەستە کردن و نیشاندانی لە رێگەی هونەری سینەماوە، بە تایبەتی بواری سینەمای دیکۆمێنتی، ئەوا یەڵماز گۆنای و کارە هونەرییەکانی، بە حوکمی ئەوەی گەورەترین پانتاییان لەو وارەدا گرتووەتەوە لە ریزی هەرە پێشەوە دێن و دەبێ هەڵوەستەی تەواویان لەسەر بکرێ.

گۆنای لە ساڵی 1937دا لە گوندێکی دوورە دەستی چەپەکدا بە نێوی (یەنیجە) لە باشووری تورکیا لە دایك بووە، لە خانەوادەیەکی یەجگار هەژار بووە، ناویان نا یەڵماز (واتە: خورت، بەهێز، پتەو) دایك و بابی بۆیە ئەو ناوەیان لێنا، بەو هیوایەی کە ببێ بە فەلاحێکی بەهێزو رۆژێ لە رۆژان باری سەرشانی بابە هەژارەکەی سووك بکات، بەلەنگازانە قەت بیریان بەلای ئەوەدا نەدەچوو رۆژێك لە رۆژان ئەو منداڵە دەبێ بە یەکێك لە ناودارەکانی جیهان، دەبێتە مایەی شانازی گەلەکەی، یان لە قەبرستانی گەورە ناودارانـدا دوور لە زێدو مەفتەنی خۆی لە پاریسی پایتەختی وڵاتی فەرەنسادا دەنێژرێ.

گۆنای دەربارەی لە دایك بوونی خۆی دەڵێت: "من وەکو هەموو منداڵانی گوندەکەمان درەنگ تەسکەرەم وەرگرتووە، بۆیە بە تەواوەتی رۆژی لە دایك بوونەکەم نازانم".

یەڵماز گۆنای لە خانەوادەیەکی کورد لە دایك بووە، وەك زۆر خێزانی کوردی دیکە، لە سیوەرەك—ەوە، کۆچیان کردووەو کوردستانیان بە جێهێشتووە، ئیدی یان لە برسان یان لە ترسی زوڵم و زۆرو چەوسانەوەی رژێمی تورکیا، ئەم خانەوادە کوردە، وەکو زۆر خێزانی کوردی دی ناچار لە چوارچێوەی سیاسەتی تواندنەوەو بە تورککردنی گەلانی غەیرە تورکدا، ناوی خێزانەکەیان گۆڕیوەو کردوویانە بە (بوتون).

هەڵبەتە گۆنای وەکو هەموو منداڵەکانی دیکەی گوندەکەی خۆیان، برسیەتی، سەرما، رووت و رەجاڵی، هەژارەو، گیروگازی کار کردنی لە منداڵییەوە، جەڕباندووە، دیارە ئەم ژیانە سەخت و دژوارە بووە بە هەوێنی بیرو بیرکردنەوەی و پاشان کاری کردۆتە سەر پێکهاتەی هۆش و گۆشی.

جا یەڵماز گۆنای لە باسی خۆیدا دەڵێت: "هەتا ئێستا ئەو دژواریی و کول و کۆڤان و تاڵاوانەم لە یادن کە لە منداڵیدا چەشتوومن، بیرمە، چاکم لەبیرە خۆشی بەرێکەوتیش رووی نەکردۆتە ماڵی ئێمە. بابم، بە بەردەوامی، لە خوت و خۆڕایی، یان لەبەر بچووکترین شت، لە داکمی دەدا، لە ماڵ وەدەری دەنا، زۆرجار ئێمەی زاروکێشی لەگەڵدا وەدەردەنا. دار توویەك و دوو دار هەنجیر لە بەرانبەر ماڵەکەمان بوو، تاکو بەیانی لەگەڵ دایکمدا لە ژێر ئەو دارانە دەنووستین. بەڵام دایکم هەندێ جار دەستی من و براکەمی دەگرت و بە پێیان دەمانمکوتا بۆ ماڵی خزمێکمان لە ئەزەنە– بەینی گوندەکەمان و ئەزەنە 27 کیلۆمەتر بوو. هەرگیز ناتوانم حاڵی دایکم لە بیر بکەم کە بە درێژایی رێگەکە دەگریا، بە تایبەتی ناتوانم ئەو گۆرانییە خەمین و تۆڵە ئامێزانە لەبیر بکەم کە دایکم بەدەم فرمێسکەوە دەیگوتن..."

یەڵماز لە ژینگەیەکی زۆر سەختدا ژیاوە، بەڵام ئەم سەختی و دژوارییە کۆڵی پێنەداوە، بەڵکو گیانی رەفزو بەگژاچوونەوەی لەلا دروست کردووە. بە خۆی باسی ئەو بارودۆخە دەکات و دەڵێ: "من کوڕە جوتیارێکی هەژارم، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ناچارت دەکات جۆرە ژیانێکی تایبەتی بژی، کەبە قووڵی کار لە هۆشمەندی و هۆشیاری بنیادەم دەکات. کە منداڵ بووین هاوڕێیەکم هەبوو ناوی سلۆ بوو، ئەویش کوڕە جوتیارێکی هەژاری وەکو بابی من بوو. کوڕە ئاغاکان نا چاریان دەکردین گەمەی عەرەبانەو ئەسپیان لەگەڵدا بکەین. دیاری ئێمە ئەسپ بووین و بەکندر عەرەبانەکەیان پێوە دەبەستین و ئەمریان پێدەکردین بە بەردەمیان دا غار بدەین، جارێکیان سلو نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکی دوورو درێژ، بردیان بۆ شار بۆ چارو مالیجە، بەڵام سلۆ بە جەنازەیی بەسەر عەرەبانەیەکەوە هێنراوە کە دوو ئەسپ رایان دەکێشا، ئیدی لەو رۆژەوە رازی نەبووم ببمە ئەسپ لە گەمەی منداڵە دەوڵەمەندانداا..."

هەڵبەتە ئەم گیانی رەفزو بەگژاچوونەوەیە لەگەڵ یەڵمازدا هات و گەورە بوو، ئەگەر لە منداڵیدا کاردانەوەیەکی منداڵانەو بێ ئاگایانە بوو بێ، ئەوا لە گەورەییدا بە هۆشیارییەوە مومارەسەی کردووە. بابی یەڵماز دەیویست، یەڵماز ببێ بە وەرزێرێکی خورت و چەلەنگ، لە قوتابخانەدا چۆنیەتی چاندنی تووتن، و هونەری کێشانەی پەموو و فرۆتنی فێر بێ، لێ یەڵمازی سەرسەخت شتێکی دیکەی دەویست "... دەمزانی چم دەوێ، بەڵام بێگومان ئەوەی من دەمویست ئەوە نەبوو کە بابم دەیویست.".

هەموو هۆش و گۆشی یەڵماز هەر لەلای خوێندن و خوێندەواری بوو، لە دڵی خۆیدا بەڵێنی بەخۆی دەدا کە بە هەر نرخێ بووە بخوێنێ و خوێندن تەواو بکات. دیارە ئەم مکوڕ بوون و سوور بوونە لە هەندێ نووسینیدا رەنگی داوەتەوەو بەرجەستە کراوە بە تایبەتی لە رۆمانی (بەلارە ملێوە مردن، لە ساڵی 1972 خەڵاتی ئورهان کەمالی وەرگرت کە گەورەترین خەڵاتی ئەدەبی تورکیایە)، کە لەوێدا کامبیر، کە جووتیارێکی هەژارە، هەموو شتێك دەکات بۆ ئەوەی (رەمزی) کوڕی بناتە بەر خوێندن.

خوێنەر هەست دەکات کە لێکچوونێکی زۆر لەنێوان ژیانی یەڵمازو قارەمانە چکۆڵەکەی رۆمانەکەدا هەیە، ئەو منداڵە، زۆر دڵپاك و پڕ سۆزە، بەڵام سەر سەخت و چاو قایمە، بەو منداڵییە

دەیەوێ مرۆڤێکی ئازاد بێ، ملکەچی کۆمەڵگەی فیودالّی نەبێ، تاقە ڕێگەش بەلای ئەوەوە هەر خوێندنە.

جا سەر بهوردی یەڵمازیش بە دوور لە ڕۆمانسیەتی ناو چیرۆك و ڕۆمانان وابووە، وێڕای ئەوەی بابی زوو مردووە، دووچاری دژواری سامناکی ژیان و بژێوی بووە، بەلاّم دەستبەرداری خوێندن نەبووە. سێ پۆلی سەرەتایی لە گوند خوێندووە، بەدەم خوێندنەوە کاری وەرزێری کردووە، پاشان قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی لە شاری ئەزەنەی باشووری تورکیا تەواو کردووە، یەڵماز بە ڕۆژ دەیخوێندو بەشەو کاری دەکرد، کاری جۆراوجۆری دەکرد، ناچار بوو کار بکات، لەلایەکەوە بۆ دابین کردنی ژیانی خێزانەکەیان و لەلایەکی ترەوە بۆ دابینکردنی خۆراك و پۆشاك و دەفتەرو کتێبانی قوتابخانە.

یەڵماز گۆنای ئەم لاوە خورت و کۆڵنەدەرە زوو پەی بەوە برد کە لە شەڕی ژیاندا تەنیاو تەنیا باڵەو پێویستە بەرەنگاری بێتەوەو سەر بکەوێ بۆیە لێبڕا واقیعیانە ژیان بفامێ و دەرکی بکات، لە گەل نزیك بێتەوە، تا زیاتر بیناسێت و هەست بە ئێش و ئازارەکانی بکات.

گوتمان یەڵماز گۆنای لە پێناوی ژیاندا کاری جۆراو جۆری کردووە. یەکێك لەو کارانەی ئیش پێ کردنی فیلمان بووە لە کۆمپانیای (ئەند فیلم)دا. ڕۆژانەی حەوت لیرەی تورکی بووە. پاشان چووەتە کۆمپانیای سینەمایی (کەمال فیلم) و ڕۆژانەی هەشت لیرە بووە. لە ساڵانی 1952-1954دا کاری لە کۆمپانیای نێو براودا کردووە. ئەم کارە وای دەخواست بە گوندو شارەکانی کوردستاندا بگەڕێ، بە تایبەتی لە ناوچەکانی ئالعەزیز و غازی عەنتاب و دیاربەکر... ئەمەش وایکرد یەڵماز لە نزیکەوە بەژیانی کرێکاران و وەرزێران و جووتیاران و چەوساوانی هاو نەژادی خۆی ئاشنابێ. بیر بکاتەوە، پرسیار لەخۆی بکات, ئەدی ئەویش کورد نییە؟ بۆچی بابی هاتۆتە ناوچە تورکییەکان؟ ئەم جیاوازییە زۆرە چییە لە نێوان ژیانی ناوچە کوردنشینەکان و ناوچە تورك نشینەکاندا؟

بەرەبەرە بیۆ دەرکەوت کە خانەوادەکەیان یەکێکە لە قوربانییەکانی سیاسەتی بە تورککردن، ناچاریان دەکەن بە تورکی قسان بکەن، لە قوتابخانەدا فێریان دەکەن کە هەمووەمان تورکین.

هەروەها گەڕان بەناو کوردەواری و تێکەڵ بوون لەگەڵ کورداندا وایکرد یەڵماز لە نزیکەوە ئاشنای داب و نەریت و خووخدەو کەلەپوورو فۆلکلۆری کوردی ببێ و لە هەمان کاتدا ببێ بە شایەتێکی زندوو بەسەر ئەو هەموو زوڵم و زۆرەوە کە لە کورد دەکرێت. هەڵبەتە هەموو ئەم گەشت و گەڕانانە بوون بە کەرەستەو هەوێنی هەموو بەرهەمەکانی یەڵمازو زۆربەی نووسینە نۆبەرەکانی و پاشان کارە سینەماییەکانی لەو سەرچاوانە هەڵێنجاوە. چیرۆکەکانی سەرتای زادەی ڕێکەوت نەبوونە، بەڵکو زادەی گەلاڵەبوونی بیرو بۆچوونی تایبەتی بوونە دەربارەی ئەو واقیعانەی باسمان کرد، هەر ئەم هەوێنەش بوو کە جیهانبینی ڕیالیزمی کۆمەلاّیەتی لەلا مەیاند.

یەڵماز لە ساڵی 1955دا خوێندنی قۆناغی ئامادەیی تەواوکرد. چووە کۆلیژی ماف لە زانکۆی ئەنکەرە. بەلاّم زۆری نەبرد لەبەر دەستکورتی وازی لە خوێندن هێناو بۆ ئەزەنە گەڕایەوەو لە کۆمپانیای فیلمی سینەما کەوتەکار، پاش ماوەیەکی کورت چوو بۆ ئەستومووڵ و چووە کۆلێژی

ئابووری لە زانكۆی ئەستەموول. لەم سەروبەندەدا خووی دایە ئەدەبیات بەگشتیو چیرۆك بە تایبەتی. گوایە لەگەڵ چەند هاوڕێیەكیدا دوو گۆڤاری دەركردووە، بەڵام لەبەر بێ پارەیی زوو وازیان لێهێناوە.

یەڵماز كەوتە نووسینی چیرۆكی ریالیستی هەمە بابەتو هەمە نێوەرۆك، زۆربەی ئەو چیرۆكانە بەشێوەی راستەوخۆو نا راستەوخۆ ڕووداوەكانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیو ژیانی خەڵكی دەوروبەرەكەی خۆی بەرجەستە كردووە، جارێكیان یەكێك لەم چیرۆكانە لەلایەن دەسەڵاتەوە كەوتە بەر تاقیب. ئەمە لە ساڵی 1957دا بوو. ئیدی لەوە بە دواوە تا دوا ساتی تەمەنی بەداخەوە كارە ئەدەبیو سینەماییەكانی خرانە بەر تاقیبو سانسۆری هەموو حكومەتە یەك لە دووی یەكەكانی توركیا بە جیاوازی ڕێبازی سیاسیو هەڵوێستی ئایدیۆلۆژیانەوە.

ئەو چیرۆكە ناوی (هاوكێشەیەكی 3 نادیار) لە كاتی خۆیدا لە گۆڤاری 13دا بڵاوبووەتەوە. ئەم چیرۆكە باسی بارودۆخی ژیانی ئافرەتێكی هەژاری گەنج دەكات كە چۆن بووە بە قوربانی چەوساندنەوەو تالانكاری كۆمەڵگەی فیودالی. تاوانی ئەم ئافرەتە– هەڵبەتە لە روانگەی دەسەڵاتدارانی حكومەتەوە– ئەوەیە كە زاتی داوەتە خۆیو رووبەڕووی كابرایەكی فیودال وەستاوەتەوەو پێی گوتووە (هەر ئەو ڕۆژە دێ كە كۆتاییت بێ). دەسەڵاتداران ئەو رستەیەیان قۆزتەوەو یەڵمازیان بەوە تاوانبار كرد كە گوایە بانگەشە بۆ كۆمۆنیزم دەكات. ئەوە بوو دادگا بە غیابی دادگایی كردو حەوت ساڵو نیو زیندانییان بۆ بڕییەوە. بەڵام پاشان حەپسەكەیان بۆ كرد بە ساڵو نیوێك زیندانیو شەش هەیڤان دوور خستنەوە. ئیدی بەو جۆرە یەڵماز یەكەمجار بە تۆمەتی بانگەشەكردن بۆ كۆمۆنیزم حەپس كرا، بێ ئەوەی بزانێ وشەی كۆمۆنیزم مانای چییە. بە خۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: "دوو ساڵم لە زینداندا قەتاند بێ ئەوەی بزانم كۆمۆنیزم مانای چییە، بەڵام ئەو وشەیەم لێ بوو بە مەراق،و دەمویست ئەو شتە بزانم كە لە سەری زیندان كراوم، ئەوە بوو لە حەپسخانەدا ئاشنای بەرهەمو نووسینەكانی ماركس, ئەنگلزو لینین بووم... ساڵانی حەپسخانەو نەفی بۆ قۆنیا، بۆم بوون بە قوتابخانەیەكی تەواو..".

یەڵماز, لە پاڵ كورتە چیرۆكاندا سیناریۆی هەمە جۆری بۆ فیلمێن سینەمایی–ش دەنووسی، هەڵبەتە یەڵماز بە ڕێكەوتو لە پێناوی نان پەیدا كردندا هاتۆتە ناو جیهانی سینەماوە. بەڵام بە رادەیەك تینوو شەیدای ئەدەبو هونەر بوو، ناچار بوو زۆر بە جدی بیر لە فێربوونی هونەری سینەما بكاتەوە. ئەوە بوو لە ساڵی 1957دا ئاشنایەتی لەگەڵ دەرهێنەری نێودار (عاتف یەڵمان)دا پەیدا كرد. هەڵبەتە گۆنای فەزڵو چاكەی ئەو هونەرمەندەی هەرگیز فەرامۆش نەكردووەو ئەوەتا بە خۆی لە دیمانەیەكیدا، لەو بارەیەوە دەڵێت: "یەكەم كەسێك كە كاریگەری بنجبڕی لەسەر ژیانی هونەریم و ڕێبازو هەڵبژاردنی پیشەییمو دیاریكردنی ئایندەی سینەماییم هەبوو، دەرهێنەری سینەمایی (عاتف یەڵمان) بوو، كە یەكەم زەمینەی بۆ خۆش كردم كە وەكو ئەكتەر دەوری سینەمایی ببینم. بە فەزڵی ئەو چەندین ساڵ ئەو كارە هونەرییەم كرد".

لە كۆتایی ساڵانی پەنجایەكانی سەدەی بیستەدا بەهرەی یەڵماز چ وەكو سیناریستێكی سەركەوتوو و چ وەكو ئەكتەرێكی باریكەلەی باڵا دەركەوت، هەر لە یەكەم فیلمەكانییەوە وەكو

داهێنەرێکی تەواو خۆی نواند (رۆڵەکانی ئەم ولاتە، مامزی سپی, دوو پیاوە ئازاکە، زەمەنی تووتنو...) یەڵماز، لەو کاتانەدا کە دەسەلات تاقیبیان دەکردو لە دووی دەگەڕان، سیناریۆی دەنووسی، بەشداری نواندنی فیلمانی دەکرد، نەیدەویست مل بۆ ئەو بڕیارە زاڵمانانە بدات.
بەلام دەسەلات پاش چوار سالان تاقیبو راوەدوونانی, توانی لە ساڵی 1961دا دەستگیری بکاتو لە بەندیخانەی توند بکات، بۆیە لەو رۆژانەوە ئیدی یەڵماز بە حەپسخانان راهات.
پاش ئەوەی یەڵماز خرایە زیندانەوە، حکومەت دڵی بەوە خۆش کرد کە بەو کارە یەڵماز لە جیهانی سینەماو لە جەماوەرە زۆرو بە ئەمەکەکەی دوور دەخاتەوە. بەلام حکومەت خەیاڵی خاو بوو، خۆشەویستی جەماوەر بۆ یەڵمازو هونەرەکەی لەوە گەورەتر بوو کە حکومەت پێشبینی دەکرد. بە هەر حاڵ یەڵماز کۆڵی نەدا، لە بۆتەی حەپسخاناندا زیاتر قاڵ بووەوە، لە وێندەریش دەستبەرداری چیرۆك و سیناریۆ نووسین نەبوو، بە بەردەوامی نووسینەکانی بۆ وەشانخانەکان دەنارد بە ئومێدی چاپکردنو وەشاندنیان. لێ کۆمپانیا بازرگانییەکانی چاپو وەشاندن نەیاندەوێرا خۆ لە قەرەی ئەو کارە بدەن، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی گۆنای تۆمەتبارێکی سیاسی بوو و لە زینداندا بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی نووسینەکانی راستگۆو واقیعی بوون، رەنگدانەوەو دەنگدانەوەی هەژارانی تورکیای هاوچەرخ بوون، بۆیە یەڵماز بە یەکێك لە درێژەپێدەرانی ریالیزمی نوێ دەژمێردرێو بە نووسینو هونەر ئەوەی بەرجەستە کردووە.
بە هەر حاڵ ئەم لاوە تازە کورەیە ترسی خستبووە دڵی بۆرژواکانو دەسەلاتدارانەوەو سانسۆرێکی زۆری لەسەر بوو، و نەیاندەهێشت بەرهەمەکانی بلاوببنەوە، بۆیە یەڵماز بوتون بە ناچاری ناوی ئەدەبیو هونەری خۆی گۆڕیو ناوی خوازراوی گۆنای بۆ خۆی هەڵبژارد کە بە تورکی مانای باشووریو بە کوردی مانای هەژار دەگەیەنێ.
هەڵبەتە ئەو ناوە بە رێکەوت و لە خۆڕا هەڵنەبژێردرا، بەڵکو زادەی کولو کۆڤانی تایبەتی خۆیو لە هەمان کاتدا بەگژاچوونەوەی دەسەلات بوو، چونکە (یەڵماز گۆنای) دەلالەتی گەورەو دەوڵەمەندی هەیە (نەبەز باشووری– هەژاری خورت) دەگەیەنێ، ئیدی گۆنای لەو رۆژە بە دواوە بوو بە ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمانی تاریکی تورکیا، بەمجۆرەو لە زینداندا قۆناغێکی هەرە سەختو گرنگی دروست بوونی کەسایەتی هونەریو سیاسی گۆنای تەواو بوو، و قۆناغێکی گرنگترو قووڵتر دەستی پێکرد کە ئەویش دانانی هێڵە گشتییەکانی رێچکە هونەرییەکەی بوو.

## ئەفسانەی ( پاشای ناحەز ):

زیندانو حەپسخانە نەك هەر کۆڵیان بە یەڵماز گۆنای نەدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئاواتەکانی دەسەلاتی لە قوولایی زیندانەکاندا لە گۆڕناو، زیندانی کرد بە قوتابخانەیەكو تواناو بەهرەکانی لەوێندەرەوە گەشانەوە. لەو گۆشەو پەناو پاسارە تاریکانەوە دەستی بە نووسینی رۆمانە بەناوبانگەکەی (بەلارە ملێوە مردن) کرد کە پاشان گەیاندییە ئاستی نووسەرانی ناوداری جیهان، ئەم رۆمانە بۆ زۆر زمانی زندووی جیهان وەرگێردراوە.

بەڵێ، گۆنای لە زینداندا بوو بە نووسەرو هونەرمەندێکی واقیعی پەیامدار. لەو رووەوە دەڵێت: "زیندان بە هیچ جۆرێ کاری تێنەکردم... ئەو چیرۆکەی نووسیم لە واقیعەوە وەرمگرتبوو، بەئەمانەتەوە باسی بەسەر هاتو ئەزموونەکانی خۆمو ئەزموونی هاورێیانی دیکەم تیایدا کردبوو، لەوساوە من بابایەکی ئەمین و دڵسۆزو وەفاداری ئەم هێڵە واقیعییەم لە هەموو کارەکانمدا، چ کارە ئەدەبییەکانمو چ کارە سینەماییەکانم".

یەڵماز لە زینداندا بیری لەوە دەکردەوە کە پاش ئازاد بوون چ بکات، لە ئەنجامدا گەییە ئەو قەناعەتەی کە لە رێگەی سینەماوە هەموو ئاوات و ئارەزووەکانی دێنە دی. بەڵام چۆن؟ پاش لێکدانەوەو تاوتوێ کردنی هەموو لایەنێکی ئەو بابەتە گەییە ئەو قەناعەتەی ئەم لە رێگەی نواندنەوە لە فیلماندا، یا فیلمی بازرگانی و بازاریش بن دێتە دی، گرینگ ئامانجە.. کە لە زیندان هاتە دەرێ، ماوەیەکی زۆر بە دوای کاردا گەڕا، هەر کارێك بێ، ئەنجام بەختی کرایەوەو لە کۆمپانیای میریج فیلمدا کاری دۆزییەوە، لەوساوە، واتە لە سەرەتای ساڵی 1963ـەوە ئیدی یەڵماز وەکو ئەکتەرو سیناریستێکی بەهرەدارو ئایندە رووناك کەوتە سەر شاشەی سینەمای تورکی و رۆژ لە دوای رۆژ پتر دەکەوتە بەر رۆشنایی و زیاتر دەناسراو جەماوەری پەیدا دەکرد. هەڵبەتە ئەمە داموو دەزگا ئەمنییەکان و بۆرژوایانی خودان سینەما بازرگانییەکانی نیگەران کرد، لە بەینی خۆیاندا کەوتنە چپە دوو، تەگبیریان چییە؟! ئەم بەڵایەیان لە کوێوە بۆ پەیدا بوو، ئەم لاوە گوندییە هەژارە، ئەم چرچاوە، لە ئەکتەرە قۆزو ناودارەکانی ئێمە جوانتر دەور دەبینێ، رۆژ بە رۆژ جەماوەری زۆرتر پەیدا دەکات، لە هەر سینەمایەك فیلمی ئەو لێبدرێ هۆڵەکان بەرناکەون؟ چ بکەن باشە؟ بەو جۆرە بۆرژواکان لە رێگەی کۆمپانیا بازرگانییەکانی سینەماو رۆژنامەوانە بازارییەکانەوە کەوتنە پەلاماردانی گۆنای و ناوی (پاشای ناحەز)یان لێنا. بۆیە بەخۆی رووی دەمی دەکاتە بۆرژوایانی سینەماو بە دەنگی بەرز پێیان دەڵێت: "... ئەگەر ئەکتەرەکانی ئێوە شاجوان بن، با من شای ناحەز بم..."

ئیدی رۆژنامەوانی بۆرژوازی ئەو ناوەیان بەسەردا بڕی. بە هەر حاڵ ناحەزانی گۆنای زۆریان هەوڵدا ئەفسانەی گۆنای لە سینەمای تورکیدا بسڕنەوە بەڵام پێیان نەکراو لە ئەنجامدا مەجبوری بوونەوەو کەوتنە پشی پشی بۆی کە بێت لە فیلمەکانیاندا کار بکات، هەڵبەتە نەك لەبەر خۆشەویستی گۆنای، بەڵکو لەبەر بوژاندنەوەی باری خواری سینەمای تورکی و وەدەست هێنانی قازانجی زۆر بۆ خۆیان.

بە هەر حاڵ، یەڵماز هەواداراانێکی زۆری بۆ خۆی پەیدا کرد، رەنگە یەکێك لە هۆیەکانی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەر چەندە گۆنای کوڕە جووتیارێکی نەداراو هەژار بوو، لە ژینگەیەکی دێهاتی پاشکەوتوو پەروەردە بوو بوو، و کۆمەڵگەی بۆرژوازی رێگەی ئەو جۆرە کەسانەی نەدەدا بەئاسانی بگەنە ناو مەملەکەتی ئەوان و پێگەیەکی دیار لە بواری هونەردا، کە بە جیهانی تایبەتی خۆیانیان دەزانی، بگرێ. هەروەها رەنگە هۆیەکی تری بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە چونکە گۆنای لە ژینگەیەکی جووتیاری پەروەردە ببوو، دەیزانی چۆن خەڵکی هەژارو بێنەواو سادە بدوێنێ، چۆن بەرجەستەیان بکات و بە چ لایەکدا ئاراستەیان بکات، بۆیە کە فیلمەکانی گۆنای لە هەر

سینەمایەکدا لێدەدرا خەڵکێکی زۆر بۆی دەچوون. چونکە جدیەتی کارە هونەرییەکانی دەیکردە کارێك ئەو خەڵکە خۆیانی تیا بدیننەوەو زۆر بە جوانی وەکو لاوێکی لێهاتووی قۆزی بەژنو باڵا رێك بێتە بەر چاویان. بە هەر حاڵ ئەگەرچی رۆژنامەی بۆرژواکان ناوی (پاشای ناحەز)یان بەسەردا بڕی بوو، بەلام ئەمە خۆی لە خۆیدا ئیعتراف بوو بە هونەرمەندی ئەوو سەرکەوتنێکی گەورە بوو کە بە زەبری بەهەرمەندیو بلیمەتی خۆی بە دەستی هێنا.

بە هەر حاڵ لەم ماوەیەداو تا ساڵی 1968 یەڵماز گۆنای لە بواری نواندندا بوو بە ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمانی سینەمای تورکی، دەرهێنەرانو بەرهەمهێنەرانی چاكو خراپ روویان لێدەنا کە کاریان لەگەڵدا بکات. یەڵماز ساڵانە لە نزیکەی "10" فیلمدا تەمسیلی دەکرد، لە ماوەی پێنج ساڵێکدا لە پتر لە 60 فیلمێکدا تەمسیلی کرد، لەوانە: (روباری سوور، مەرە رەش، باڵندەی بریندار، هەر جارێ دەمرم زندوو دەبمەوە، دوا دڵۆپی خوێنم.).

هەڵبەتە گەلێك لە ناحەزانی گۆنای، بە تایبەتی هەندێ لە رەخنەوانانی سینەمایی بۆرژوا، بابەتی فیلمەکانی ئەم قۆناغەیان وەکو چەکێك دژی گۆنایو ناوزڕاندنی گۆنای بەکار دەهێنا، گوایە ئەو فیلمانە بازرگانیو بازاڕیو میلۆدرامینو چ مانایەکیان نییەو ئەوە نایەنن تەماشا بکرێن... بە هەر حاڵ ئەو حوکمانە دوور بوون لە راستییەوەو زیاتر زادەی ئەوە بوون کە کارەکانی گۆنای شەقلی تایبەتی خۆیان هەبوو، و جیاواز بوون لە فیلمە تەقلیدییەکانی جیهانی سینەمای تورکی. لەلایەکەوەو گۆنای مەبەستی خۆی هەبوو لەلایەکی ترەوە، دەیویست شۆرەتو ناوو سامانێك پێکەوە بنێ تا پاشتر پرۆژە هونەرییەکانی خۆی پێ ئەنجام بدات، ئەو پرۆژانەی کە بەرە بەرەو بە تێپەڕبوونی رۆژگار لە مێشکیدا دەخەمڵین. دیارە بەکارهێنانی ئەم شێوازە تاکتیکییە پاکانەی خۆی هەیەو لە مێژووی هونەری جیهانیدا باوو حەڵالە. خۆ ئەگەر گۆنای ئەوەی نەکرد بووایە ئەوا هەموو پرۆژەکانی ئاییندەی بە ناکامی دەمانەوە. ئەوەتا بەخۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: "کارە بازرگانییەکانم بۆ من بەسوود بوون. بە فەزڵی ناوبانگو پایەی هونەریمو متمانەی بەرهەمهێنەرانو جەماوەری خەڵك پێمو ئەو قازانجانەی بە بۆنەی ناوو ناوبانگمەوە وەدەست دەهات، داوام کرد بەخۆم فیلمەکانم دەربێنم. دەمویست فیلمەکانم جیاوازبن بابەتو هەڵوێستی سیاسی خۆیان هەبێ، مارکسیزم وەکو فەلسەفەیەکی مرۆڤایەتی ببێ بە رێنوێنیانو وەکو میتۆدێکی ئەستاتیکیو هزری لەسەر بڕۆمو پابەندبم پێوەی".

ئامانجێکی دیکەی یەڵماز گۆنای ئەوە بوو کە واقیعی کوردەواری لەباری هونەرییەوە بەرجەستە بکاتو بە ناخی کوردەواریدا رۆبچێو نهێنییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە کەشف بکاتو زۆرجار ناوی فیلمەکانی، قارەمانی فیلمەکانی بە جۆرێ هەڵدەبژارد کە ببێ بە کلیلی کردنەوەی نهێنییەکانی کوردەواری. بۆ نموونە فیلمی (گورگی چیاکوچرەۆ) بە شێوەیەکی نا راستەوخۆ –دیارە لە ترسی سانسۆری تورکی– بەسەرهاتی قارەمانێکی میللی کورد دەگێڕێتەوە کە چۆن بەگژ سوپای تورکیدا دەچێتەوەو پاش خەباتێکی دوورو درێژو سەخت شەهید دەبێ. هەر لەو فیلمەدا چیرۆکی خۆشەویستییەکی بەتین هەیەکە لەو رۆژگارەدا مەگەر هەر لەناو کوردەواریدا،

وێڕای قەدەغە سیاسیو کۆمەڵایەتییە دژوارەکان، ڕوو بدات. یەڵماز گۆنای لە ڕێگەی کەسایەتی قارەمانی فیلمەکەوە، کارەساتی ئافرەتی کوردی بێبەش لە هەموو مافێك پیشان دەدات.
یان لە فیلمی (یاسای سنوور)دا باسی ئەو سنوورە دەستکردانە دەکات کە بەناهەق وڵاتی کوردەواری پێ دابەشو پارچە پارچە کراوە. ڕووداوەکانی فیلمی نێو براو لەسەر سنووری نێوان تورکیاو سوریایە کە ئەم بەرو ئەوبەری مین ڕێژکراوەو ساڵانە دەیان کوردی بێتاوان دەبنە قوربانی. دیارە فیلمەکە ئەو یاسا نارەوایانە ڕیسوا دەکات کە بە تۆبزی بەسەر کوردی داماودا سەپێنراون.
ئیدی ڕووداوو بابەتی زۆربەی فیلمەکانی دیکەی گۆنای دەربارەی کوردستانی تورکیاو شاخە سەرکەشەکانی کوردستانە، دەربارەی گەلی کورد، دابو نەریتی ئەو گەلەو پابەندی ئەو گەلەیە بە خاكو وڵاتی خۆیەوە. هەر هەموو ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە گۆنای هەستێکی نەتەوەیی سەرکوتکراوی لەلا بووەو گەلی خۆی خۆشویستووە، ئەم هەستە بەرەبەرە لە ڕێگەی نواندنەوە دەرکەوتووە، بێگومان ئەسڵو ژینگە کوردییەکەی، دووریان لە پێکهاتەی کەسایەتی ئەدەبیو هونەریو سیاسی ئەو بینیوە. بە خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: "بابم بەردەوام دەیگوت کە تاقە خەونم ئەوەیە کە ئەم وڵاتە بەجێبێڵمو لەم ژیانە دوونە بخەلەسێم. لە سەرەتادا لە مەبەستو مانای قسەکەی نەدەگەیشتم، لێ پاشان هەموو شتێکم لەلا ڕوون بووەوە. ڕەگو ڕەچەڵە کوردییەکەی زۆرجار دەبووە سەرچاوەی کوێرەوەری بۆی، بۆیە حەزی دەکرد لەو دەڤەرە غەریبە بار بکات. لە کاتی تورەییو هەڵچووندا، گۆرانی کوردی دەچڕی. پاشان ئەم نهێنییەشم هەڵهێنا، گۆرانی کوردی هێوری دەکردەوە، خەمو پەژارەی خۆی پێ هەڵدەڕشت."
بەهەر حاڵ با بێینەوە سەر فیلمەکانی، هەر چەندە نا حەزانی گۆنای، زۆریان غەدر لێکردو ویستیان بیشکێننەوە، بەڵام بەهرەو ڕەسەنایەتی بە هیچ شتێك ناشاردرێتەوە. مرۆڤ کە تەمەشای فیلمەکانی دەکات هەست بە واقیعیەتێکی زندوو دەکات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بایەخێکی زۆری بە گیروگرفتەکانی خەڵكو کۆمەڵگە دەدا، ئاشقێکی گەورەی هونەری سینەما بوو، لە خەمی ئەوەدا بوو کە لە خەتی باوی سینەمای تورکی لابداتو وەرچەرخانێك دروست بکات. ئەوە بوو وەرچەرخانی دروست کرد، ڕەوتێکی واقیعی بوێرانەی داهێنا، لە ڕێگەی فیلمەکانییەوە گیروگرفتی ڕۆژانەی گەلی بەرجەستە دەکرد. بەوەش تێی دەگەیاندن کە لە چ بارودۆخێکی نا هەمواردا دەژین، خەڵکی کە تێگەیشتو ئاشنای بارودۆخی نا هەمواری خۆی بوو، بیر لە گۆڕان دەکاتەوە, تێ دەکۆشێت مرۆڤانە بژی. دیارە ئەمە بە دڵی دەسەڵاتو چینی بۆرژوای تورکی نەبوو، بۆیە دەبووایە چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوە، ئیدی جارێکی دی لە ڕێگەی ڕۆژنامەوانی بازاڕییەوە کەوتنەوە پەلاماردانو تورەکردنی بۆ ئەوەی بیخەنە هەڵوێستی هەڵەوە تا بتوانن تۆڵەی لێ بکەنەوە. ئەوە بوو لە ڕۆژنامەکاندا زۆر شتیان دەربارەی گوت، لێرەدا نموونەیەك لە خەرواری ئەو قسانەی دەگێڕینەوە: "ئەگەر ڕێگە لەم لاوە سەرکێشە نەگرین، ئەوا خۆشمان بێو ترشمان بێ دێتە ناو مێژوومانەوە، جا لەوەش خراتر ئەوەیە بە ئارەزووی دڵی خۆی ئەو مێژووە تۆمار دەکات، فیلمەکانی پڕن لە دینامیکیەت، پشت بە لێدانو کوشتنو دزی

دەبەستن، بۆیە جەماوەری ئێمە خۆشیان دەوێ، تەنانەت جەماوەری رۆژئاواییش، بە تایبەتی ئیتاڵییەکان خۆشیان دەوێ".

هەڵبەتە خاوەنانی ئەو بیرو بیرکردنەوانە، حەقیقەتێکی تاڵیان فەرامۆش دەکرد، کە یەڵماز بە راستگۆیی و ئەمانەتەوە واقیعی پاشکەوتووی وێنە دەگرت و بەرجەستەی دەکرد. بۆیە تەمەشاڤان، بە تایبەتی تەماشاڤانی ئیتاڵی خۆشیان دەویست. تەمەشاڤانی ئیتاڵی گۆنای بە درێژەپێدەری ریالیزمی تازە لە سینەمادا کە مەڵبەندەکەی ئیتاڵیا بوو لە دوای دووەم جەنگی جیهانی، دەزانی.

بە هەر حاڵ بۆرژوازییەتی تورکی، ئەوەی لە توانایدا بوو دژی گۆنای کردی، بەڵام وەرەی پۆلاییینی گۆنای و باوەڕی بەسەرکەوتن لەوە بەرزتر بوو بەوان بروخێنرێ. گۆنای جێ پێی خۆی لە جیهانی سینەمادا قایم کرد، لە ماوەیەکی کورتدا بوو بەناودارترین سینەما کار لە تورکیادا، لە سەرانسەری وڵاتدا هاتەناسین، لەلاپەڕەی یەکەمی رۆژنامە گەورەکانی، لە دیواری موغازەو کۆگاکانی شارانی تورکیا، لە گەڕەکە دەوڵەمەندنشین و هەژارنشینەکانا وێنەی بڵاودەبووەوە..

بە هەر حاڵ گۆنای بەرەبەر شۆرەتی پەیدا کرد، سەروەت و سامانی بەدەست هێنا، بۆرژواکان ملیان بۆ واقیع دانەواند، لە دڵی خۆدا دەیانگوت با ئەم کابرا دزێوەش بێتە ریزی ئێمەوە، چارچییە، کەسێکە تازە بمانەوێ و نەمانەوێ هەیە. بەڵام لەم بۆچوونەشیاندا هەر بە هەڵەدا چوو بوون، چونکە شۆرەت و سامان لای گۆنای ئامانج نەبوون، بەڵکو رێگە بوون بۆ وەدێهێنانی ئامانج. بۆیە هەر بەو شۆرەت و سامانەی پەیدای کرد، کەوتە بەرهەمهێنانی فیلمێن جددی ئەوتۆ کە بگونجێن لەگەڵ بیروبۆچوونە سیاسییەکانی خۆیدا، وەڵامی ئەو دەیان پرسیارانە بداتەوە کە خەڵکانی چەوساوە دەیانکردن. ئیدی لێرەوە گۆنای سەربەخۆیی خۆی وەرگرت و لە دەرێی کۆمپانیا بازرگانییەکانەوە کەوتە بەرهەمهێنانی فیلمێن ئەوتۆ کە بگونجێن لەگەڵ بیربۆچوونەکانی خۆیدا، ئەوەی لە رێگەی هونەرەوە روون دەکردەوە کە چۆن چینی چەوساوە، کە خۆی یەکێك بوو لەو چینە، دەچەوسێتەوەو لەلایەن کێوە دەچەوسێنرێتەوە. ئیدی بەمجۆرە کەوتەخۆ تاقیکردنەوەو لە ساڵی 1968دا فیلمی (سەید خان)ی دەرهێنا. بە هەر حاڵ رەخنەگران و پسپۆرانی سینەما پێیان وایە ئەو فیلمە سەرەتای فیلمە واقیعییەکانی گۆنایەو ماناو تیمەیەکی قووڵ و ئامانجداری لە خۆگرتووە.

(سەید خان) فیلمێکی واقیعی بوو، ژیانی گوندی کوردەواری بە هەموو دواکەوتوویەکییەوە پیشان دەدا. سەید خان، کە یەڵماز بەخۆی دەورەکەی دەبینی، مرۆڤێکی ئاسایی ئەو ناوەندە کۆمەڵایەتییەیە، وێرای دەستکورتی خۆی دەیەوێ بەپێی توانا یارمەتی هەژاران بدات. کەسایەتییەکی وره بەرزە، مل بۆ زوڵم‌وزۆر نادات.

## ((فیلمی سەید خان))

تەماشاڤانان خۆیان لە کەسایەتی (سەید خان)دا دەبینییەوەو لە نێوان خۆیاندا بەفلان و فیساریان دەشوبهاند، هەر ئەوەش سەرچاوەی سەرکەوتنی فیلمەکە بوو، پتر لە 8 ملیۆن کەس

ئەو فیلمەیان بینی. ئەمەش زۆرترین ژمارەی تەماشاڤان بوو لە مێژووی سینەمای تورکیدا. هەروەها لە فیستیڤاڵی سینەمایی ئەزەنەدا، لە ساڵی 1969 خەلاتی (گوزەی زێڕین)ی وەرگرت کە گەورەترین خەلاتی فیستیڤاڵی نێو براو بوو. هەروەها گۆنای بە خۆیشی لەو میهرجانەدا خەلاتی باشترین ئەکتەری پیاوی وەرگرت. سەرکەوتنی فیلمەکە رەخنەگرانی والێکرد کە لەگەڵ فیلمی (زەوی دەلەرزێ)ی دەرهێنەری ئیتاڵیایی بەناوبانگ لوکینوفیسکونتیدا بەراوردی بکەن.

بە هەر حاڵ ئەم فیلمە هێندەی دی پایەی هونەری گۆنای چەسپاندو شۆرەتی لە سەرانسەری وڵاتدا بڵاوبووەوە. بەڵام گۆنای هەر بەوەندە سوکنایی نەدەهات. ئەز ئەزموونە هەنگاوێك بوو بەرەو رێگەیەکی دوورو درێژ، رێگەیەکی رۆشن بەڵام لە هەمان کاتدا سەخت. بەخۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەم فیلمە لە ئاستی خۆزگەکانمدا نەبوو، لاواز بوو، بەڵام بە هەر حاڵ فیلمێکی پاك بوو، بە هەر حاڵ من لە میانەی ئەزموونم لەم فیلمەدا، زۆر نهێنی ئەو پیشەیە فێر بووم, تواناو بەهرەکانی خۆم لە بواری داهێنانو چوونە ناو ئەم کایە تازەیەی پسپۆڕایەتییەوە تاقی کردەوە".

بەڵام چ چارەنووسێك بۆ ئەم کەڵە هونەرمەندە لە بۆسەدا بوو، هەر کە خۆی ئامادەکرد بۆ وێنەگرتنی فیلمێکی دی، عەسکر لەبەردەمیدا قووت بووەوە، چەلبنامەیەکیان دایێ کە بەزووترین کات بچێتە خزمەتی عەسکەری، تەگبیر؟

ساڵ، ساڵی 1968 بوو، یەڵماز لێبرا بچێتە خزمەتی ئیجباری، بێ ئەوەی شوێنی خزمەتەکە بزانێ، وەکو هەر سەربازێکی تازە تەبیلغ کراو نیگەران بوو، بەڵام ئەو حاڵەتە زۆری درێژە نەکێشا. خۆیو بەختی نێردرا بۆ شاری موش، کە زێدی دایکی بوو. یەڵماز لەوێندەرو لە نزیکەوە شارەزای ژیانی سەختو دژواری گەلەکەی بوو. یەڵماز جاران دانی بە کوردبوونیخۆیدا دەنا , هەندێ شتی کەمی دەربارەی دابو نەریتو خووخدەو وەزعو حاڵی گەلەکەی خۆی دەزانی، بەڵام لەوێ، لە شاری موشی قوڵایی کوردستانی تورکیادا، ئاشنای کولو کۆڤانی راستەقینەی گەلە زوڵم لێکراوەکەی بوو. دیارە یەڵماز بە چاوی دڵ ئەو دیمەنانەی دەبینی، دەیزوانییە چارەنووسی گەلەکەی، لە ناخەوە هۆیەکانی کلۆڵیو داماویو پاشکەوتوویی کوردی تاوتوێ دەکردو لەبن پەرەی دڵییەوە کۆی دەکردەوە تا پاشانو بەرە بەرە بە چەکی کامیراو هونەری سینەما پیشانی هەموو دنیای بداتو گوزارشتی لێ بکات.

یەڵماز بە جۆرێ ئاوێتەی هونەری سینەما بوو بوو، کە هێز نەبوو لەو جیهانەی دابڕێ یان دووری بخاتەوە، بۆیە خزمەتی عەسکەری نەیتوانی لە جیهانی سینەمای دوور بخاتەوە. ئیدی ئەوە بوو تووشی نەخۆشی پشت یەشە هاتو لە جێگەدا کەوتو مۆڵەتی وەرگرت. ماوەی ئەم نەخۆشییەی بە هەل زانی تا پەیگیری کاری سینەماییو دەرهێنان بکات. دەرهێنەری پێشکەوتوخوازی تورك ئەردین کیرال لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەربارەی یەڵماز دەڵێت: "بە راستی مرۆڤێکی سەیر بوو، هەموو تەمەنی خۆی لە زیندانەکاندا بردە سەرو، بێ وچانو یەك نەفەس بە هەموو تواناو عەقڵییەوە دژی فاشیزمو کۆنەپەرستییەتی باوی وڵاتەکەما تێکۆشا، بێ ئەوەی بۆ تاقە ساتێك چەکی سینەما فەرامۆش بکات.".

یەڵماس, گوێی بەنەخۆشییەکەی نەدەدا, سڵی لە چاودێری ناحەزەکانی نەدەکردەوە, بەڵکو مۆڵەتی نەخۆشیەکەی کە -3 مانگ بوو لە ئەستەموولْ- تەرخان کرد بۆ نووسینی سیناریۆی فیلمی (گورگانی برسی)و دەرهێنانی ئەو فیلمەو بینینی دەوری سەرەکی لە فیلمی نێوبراودا، بەڵام هەر کە دەسەڵاتی عەسکەری بەمەی زانی، مۆڵەتەکەیان هەڵوەشاندەوەو داوایان لێکرد بە زووترین کات پەیوەندی بە یەکە عەسکەرییەکەی خۆیەوە بکاتەوە، وەکو سزایەکیش لە پلەی ئەفسەری بێ بەشیان کرد، لە کاتێکا بە حوکمی ئەوەی زانکۆی تەواو کردبوو هەقی خۆی بوو پلەی ئەفسەری بدرێتێ.

دوای فیلمی (گورگانی برسی) یەڵماز کەوتە کار کردن بۆ دەرهێنانی فیلمێکی دیکە بە ناوی (ناحەز). ئەم فیلمەی لە هەندێ بەسەرهاتی خۆیەوە هەڵێنجاوە، کە بە منداڵی دەچێتە قوتابخانە منداڵە دەوڵەمەندان گاڵتەی پێدەکەن و بە دیمەنی ناحەزو شەپرێوو شڕۆڵەی جلەکانی پێدەکەنن. یەڵماز ئەم دیمەنەی زۆر بە سەرکەوتووی لەسەر شاشە بەرجەستە کردووەو هەوڵی داوە بەهەموو توانایەکییەوە هەندێ قۆناغی ژیانی خۆی، بە تایبەتی قۆناغی چوونە نێو جیهانی سینەما وێنە بگرێ.

دیارە بیرۆکەی سەرەکی فیلمەکە بریتییە لە ریسوا کردنی کۆمەڵگەی بۆرژوازی و چینە چەوسێنەرەکانی بۆرژوا کە گوێ بە چارەنووسی هەزاران هەژاری بەهرەداری داهێنەر نادات. هەڵبەتە فیلمی نێو براو سەرکەوتنێکی کەم وێنەی بەدەست هێناو بووە مایەی ئافەرین و ستایشی تەماشاڤانان و پسپۆڕان و شارەزایان، ئەوە بوو لە میهرەجانی ئەنتاکیای ساڵی 1970دا بە باشترین فیلمی ساڵ لە قەڵەم دراو گۆنای نازناوی باشترین ئەکتەری پیاوی وەرگرت و خەڵاتی باشترین ئەکتەری ئەو ساڵەی وەرگرت.

بەو جۆرە خزمەتی عەسکەری نەك یەڵمازی سارد نەکردەوە بەڵکو بە پێچەوانەوە سوودی لە خزمەتی عەسکەری وەرگرت. کە لە خزمەتی سەربازی رەها بوو، قۆناغێکی دیکەی هونەری دەوڵەمەند لە ژیانی هونەرمەندی گەورە دەستی پێکرد کە وەرچەرخانێکی گەورە بوو نەك هەر لە مێژووی سینەمای تورکیدا بەڵکو لە مێژووی سینەمای هەموو وڵاتانی جیهانی سێیەمدا.

یەڵماز گۆنای خۆی لە زۆر بواری ئەدەبی و هونەری داوە، رۆمانی ئەدەبی نووسیوە، کتێبی چیرۆکی واقیعی نووسیوە, فیلمی زۆر جوانی سینەمایی داناوە، هەموو ئەمانەی کردووە، نەك بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان، یان بۆ رازیکردنی لایەنێك، بەڵکو لەبەر ئەوەی کردووە کە کەسێکی ژیاندۆست و مرۆڤپەروەر بووەو تا ئەوپەڕی توانا تەمەن و ژیان و ئیسراحەتی خۆی بۆ تەرخان کردووە، نەیدەتوانی لە ئاستی ئەو هەموو زوڵم و زۆرەی دەورووبەریدا بێدەنگ بێ، بەوپەڕی راستگۆیی و بوێرییەوە باجی بێدەنگ نەبوونی دەدا.

گۆنای، هەر چەندە مرۆڤێکی سادە بوو، بەڵام دڵێکی هێندە گەورەو ئاوەدانی هەبوو، دڵێکی هێندە بە جۆشی هەبوو، دڵێکی هێندە پڕ سۆزی هەبوو کە جێی خۆزیو ئاوات و ئامانج و خەون و کول و کۆڤانی هەموو هەژارانی تێدا دەبووەوە ئەوەتا لە زیندانی سەلمییەوە، لە 1972/7/10دا نامەیەك بۆ فاتیمەی هاوسەری دەنێریّو دەڵێت: "خۆشەیستەکەم ژیان دەرفەتی

نەداین بە ئارامی ژیانێکی خۆش بەسەر بەرین، ئەویش لەبەر هۆیەکی سادە، لەبەر ئەوەی هەست بە خەمو ژانی خەڵکانی دی دەکەین، خەمو ژانی ئەوان بەهی خۆ دەزانین، ئێمە پەرۆشی کارەساتی خەڵکانێکین کە قەت نەمان دیتوون، فرمێسکی ئەوان جەرگمان لەت لەت دەکات... فرمێسکمان تەنانەت بۆ پیشلەش رشت، سروشتو هێلانەی چۆلەکانمان پاراست... چەند جوانە ئازیزەکەم بەشداری ژانو کولو کۆڤانی خەڵکی بکەین، و چ گەورەییەکە یارمەتی خەڵکی بدەی کە لە کوێرەوەری رزگار بێ... لە ژیاندا ئازاری زۆرم چەشت، بەڵام ئەم ژیانە چەند شیرینو جوانە. خەڵکیت خۆش بویۆ یارمەتییان بدە، کارێکی وەها بکە ئەوانیش خۆشیان بویێ، لە ژیان بێ ئومێد مەبە، مەیەڵە شادی لێت بتۆرێ، بە خۆشیو شادی لە ژیاندا بەگژ کولو کۆڤانەکانتـــــــــــــــــــــــــــدا بچـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــوەوە..."

دیارە ئەو ناوەرۆکە مرۆڤانییەی کە بەو زمانە سادەو ناسکە هاتۆتە دەربڕین، لە ژیانو لە هەڵوێستو لە هونەرەکەشیدا رەنگی داوەتەوەو پێی وابووە هونەری راستەقینە ئەوەیە بتکات بە هاوبەشی خۆشیو ناخۆشییەکانی خەڵکی، هونەرمەند لە سەرێتی حەقیقەت بە جەماوەری خەڵك بگەیەنێ, ئەو حەقیقەتەی زۆرداران بۆ قازانجی خۆیان لە خەڵکی دەشارنەوە... جا هەر لەو پێودانگەوە یەڵماز لە هەوەڵی ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا فیلمی (ئومێد)ی دەرهێنا کە بۆ خۆی وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە مێژووی سینەمای تورکیداو دەرهێنەری تورکی (ئەردین کیرال) لەو بارەیەوە دەڵێت: "فیلمی ئومێد بەردی بناغەی سینەمای تورکی دانا، بە سەرەتای هەموو سەرەتاکان دادەنرێ، بۆ یەکەمجار لە مێژووی سینەمای تورکیدا بەوپەڕی راشکاوی بابەتی واقیعی پیشان دەدریۆ دەخرێتە روو، بۆ یەکەمجار لە مێژووی هونەری سینەماییماندا فیلمێکی سادە وێنە دەگیرێ کە رووداوەکانی لە ژیانی رۆژانەمانەوە وەرگیرابێ، نەك شتێکی دەستکردو سواو بێ، وەکو باوە لەلامان...."

هەڵبەتە ئەم کارە (فیلمی ئومێد) نوقڵانەی لە دایك بوونی هونەرمەندێکی سەر بە گەلی پێ بوو، نوقڵانەی لە دایکبوونی هونەرێکی پێ بوو کە خەمو ئازاری گەل بەرجەستە بکاتو تیرەی بەشەر شانازی پێوە بکات. (سما بوراس)ی دەرهێنەری تورکی لە هەندەرانەوە وتارێك بەناونیشانی "پاشای ناحەز ئومێدمان بۆ دێنێ" دەربارەی ئەو فیلمە دەنووسێتو دەڵێت: "... من رکم لە فیلمی تورکی بازرگانیو بازاڕی بوو، حەزم نەدەکرد ئەو فیلمانە ببینم، زۆر بە کەمی دەچووم بۆ سینەما، بەڵام جارێك بە رێکەوت.... لە هۆڵی سینەمایەکی تورکیادا فیلمی ئومێدم بینی، کە فیلمەکەم بینی کەوتمە ناو گێژاوێکی دەروونییەوەو هەستێکی ئاڵۆزم تێئالا، پێشتر ئەو هەستەم نەکردبوو. ئەوسا هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو لە دڵی خۆدا گوتم، ئاقیبەت سینەمای تاریکی تورکی تروسکەیەکی لێ هەڵهات. دەتوانم بە دوور لە زێدەرۆیی بڵێم کە فیلمی ئومێد شۆڕشێکی راستەقینەی لە سینەمای تورکیدا بەرپا کرد. دەرهێنەری فیلمەکە یەڵماز گۆنای بوو کە ئەکتەری دڵخوازی منو خۆشەویستی هەمووان بوو... لە راستیدا ئەم فیلمە بە دیاردەیەکی داهێنان دادەنرێ کە دەبێ بە بەردەوامی بچینەوە سەری، بە تایبەتی بۆ ئێمەی سینەماکارانی لاو..."

ئامادەكردنی ئەو فیلمە تەنیا (2) مانگی خایاند، لە میهرەجانی سینەمایی ساڵانەی سەرانسەری توركیادا لە ئەزەنە، لە پایزی ساڵی 1970دا پیشاندرا، گەورەترین خەڵاتی میهرەجانەكەی دراێی و بە باشترین فیلمی ساڵ دانرا، گۆنای بە خۆیشی نازناوی باشترین ئەكتەری، لە دەوری پیاواندا وەرگرت، هەروەها سیناریۆی فیلمەكەش بە باشترین سیناریۆی ساڵ دانرا، كەچی بەو هەموو سەركەوتنەوە دەسەڵاتدارانی حوكمڕان لێدانی فیلمەكەیان لە سینەماكانی توركیادا بەو بیانووە قەدەغە كرد كە گوایە حەقیقەتی كومەڵگەی توركی دەشێوێنێ! لەمەش سەیرتر ئەوەبوو، كە وێڕای بڕیاری سەرپەرشتیاران و رەخنەگران و هونەرمەندانی میهرەجانەكە، كە فیلمی نێوبراو بنێردرێ بۆ هەندەران تا بە ناوی توركیاوە لە فیستیڤاڵە جیهانییەكاندا بەشداری بكات، حكومەتی توركیا رازی نەبوو، بۆیە گۆنای لێبڕا بە هاوكاری هەندێ لە دۆستەكانی فیلمەكە پارچە پارچە بكات و هەر جارەی پارچەیەكی بۆ هەندەران بنێرێ. دیارە ئەمە خۆی لە خۆیدا جۆرە سەرپێچییەكی یاسایی بوو، بەڵام گۆنای لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەگەر ئەم كارە خەتایەك بێ و من كردبێتم، ئەوا شانازی پێوە دەكەم، چونكە من ئاكامەكانی ئەم كارەم چ لە ئاستی ناوخۆو چ لە ئاستی دەرەوە دەزانم..."

دیارە بۆچوونەكانی یەڵماز دروست بوون، فیلمەكە سەرنجی ئەوروپاییەكانی راكێشا، لە فیستیڤاڵی غرینوبڵدا خەڵاتی تایبەتی لیژنەی هەڵسەنگاندنی وەرگرت، لە وڵاتانی ئەوروپا، ئاسیاو ئەفریقیای باكووردا پیشاندراو سەركەوتنێكی بێ وێنەی بە دەست هێنا، رۆژنامەی (جون ئەفریك)ی تونسی بە یەكێك لە باشترین فیلمەكانی وڵاتانی سێیەمی لە قەڵەمدا. بێگومان ئەم فیلمە گۆنای وەكو دەرهێنەرێكی جیهانی ناساندو لە فیستیڤاڵە سینەماییە جیهانییەكاندا بوو بە مایەی بایەخ پێدان و رەخنەگران لە وڵاتانی جیاوازەوە كەوتنە شیكردنەوەو هەڵسەنگاندنی كارە هونەرییەكانی و زۆربەی رەخنەگران بە بەهرەیەكی دەگمەنیان لە قەڵەم دەدا.

دیارە یەڵماز وەكو هونەرمەندێكی ریالیستی لە ناوەوە دەیڕوانییە گیروگرفتەكانی كۆمەڵ و لە نزیكەوەو مرۆڤپەروەرانە خەمو ئازارەكانی كۆمەڵی دەهونەراند، ئەوەتا رەخنەگری سینەمایی یۆنانی بەنێوبانگ دمیتریس زایناكیس لەو بارەیەوە دەڵێت: "یەڵماز گۆنای ژیانی رۆژانەی گەلی وێنە گرتووە. بۆیە رووداوەكانی ناو فیلمەكانی بە بەڵگەنامەی زندوو دەژمێردرێن و گەواهی لەسەر هەژاری و پاشكەوتووی و چەوساندنەوەی گەلە زۆرلێكراوەكەی دەدەن".

هەڵبەتە هونەری رەسەن زۆرجار دەكەوێتە سەرووی تەعلیقەوەو هەمیشە سیحرو جادوویەكی ئەوتۆی تیا دەمێنێ كە بە وشە نەیەتە دەربڕین. دیارە ئەو كارە هونەرییە بە زەبری رەسەنایەتی خۆی زۆر رەخنەگری سینەمایی و ئەدیبان و هونەرمەندانی جیهانی هێناوەتە قسەو زۆربەی راوبۆچوونەكانیش بە قازانجی كارەكە شكاونەتەوە. دەكرێ لێرەدا دەقی ئەو راوبۆچوونانە بخرێتەڕوو، بەڵام لەبەر زۆری داوای بوردن لە خوێنەران دەكەین و گەر مەبەستیان بێ ئەو راوبۆچوونانە بزانن دەتوانن لە ئەسڵی سەرچاوەكاندا پەیدای بكەن. بەڵام لێرەدا بە پێویستی دەزانین گوێ لە هەندێ تەعلیق و قسەی گۆنای بگرین لەو بارەیەوە: "سەبارەت بە فیلمی ئومێد پێم وایە كاركردنم لە بواری دەرهێنان و پەروەشی سیاسیم كردویانەتە كارێك كە بە یەكجاری

دەستبەرداری وەکو دەڵێن فیلمی بازرگانی بەنجکەربێنم، ئەو فیلمانەی تەماشاڤان بۆ هەڵاتنی کاتی هاندەدەن، پەنام وەبەر قارەمانی واقیعی و ئیجابی بردووە، بابەتی واقیعی و زندوو، و مالیجەی واقیعیم هەڵبژاردووە، بە تەواوەتی پشتم کردۆتە کۆتاییە شادو خۆشەکان، ئەو کۆتاییانەی کە سینەمای ئەمریکی بازاڕیی و ژەهراوی رای هێنا بووین لەسەریان..."

ئیدی ئەوەبوو کرۆك و جەوهەری پەیامی گۆنای لە رێگەی سینەماوە، هەڵبەتە ئەم فیلمە بە تایبەتی لە وڵاتانی سێیەمدا دەنگدانەوەیەکی یەجگار گەورەی بوو، شۆڕەتێکی یەجگار زۆری وەکو هونەرمەندێکی جیهانی بە دەرهێنەرەکەی (یەڵماز گۆنای) بەخشی.

زۆربەی رووداوەکان لە شاری ئەزەنەدا روو دەدەن. قارەمانی فیلمەکە ناوی جەبارە، یەڵماز بە خۆی دەوری جەبار دەبینێ. جەبار عەرەبانچییە، لە دەست زوڵم و زۆری ئاغا هەڵاتووەو بە ئومێدی ژیانێکی باشتر لە گوندەوە رووی کردۆتە شار، شەوو رۆژ بەسەر ئەو عەرەبانەیەوە کار دەکات. جووتێ ئەسپی لەڕو لاوازی لە برسا مردەڵەی لە ژێردایە، ئەسپەکان هی خۆی نین، بەڵکو بە قەرزو بە هاوکاری برادەرێکی کڕیوونی. رۆژان تێ دەپەڕن، جەباری داماو رۆژی 8- 10 لیرەیەکی دەستدەکەوێ. ئاخر بەو چەند لیرە کەمە حەوت سەر حخێزان بە خێو دەکرێ؟ ئیدی بەرە بەرە قەرزو قەرزاری بەسەرییەوە کەڵەکە دەبێ. بێگومان جەبار ئەو قەرزانەی پێ نادرێتەوە. ئەی تەگبیر؟ پەنا وەبەر کڕینی بلیتی یانەسیب دەبات، ئێ بەڵکو بلیتێکی بۆ دەربچێ، زۆر دڵ بەو بلیتانە خۆش دەکات، بەڵام تاقە یەك بلیتی بۆ دەرناچێت و هیواو ئاواتەکانی هەرەس دێنن.

هەڵبەتە هەر جەبار وانییە، بەڵکو دۆستێکی تری بێکاری هەیە بە نێوی حەسەن، کە ئەویش خەون و خەیاڵ بە گەنجینەی شاراوەوە دەبینێ. ئیدی دەیەوێ جەبار قاییل بکات و باسی مسۆگەری پرۆژەکەی خۆی بۆ دەکات و دەڵێت: "ئەگەر بە گوێم بکەی خۆت و خێزانەکەت رزگار دەکەیت... من ئەو شێخەم بینی، خۆزگە دەتبینی، هەر دەڵێی ئەولیای خوایە, ئەگەر شێخمان قاییل کردباو چەند ئایەتێکی بۆ خوێندباین.. ئەوا گەنجینەکەمان دەدۆزییەوە." بەڵام جەبار لە دڵی خۆیدا گاڵتەی بە خەونەکانی حەسەن دێ و دەڵێت: "ئومێدی حەسەن وەهم و خەیاڵە.. کڵۆڵ خۆت، بە تەمایە بە دوعاو نزایان زێڕو زیوی بن عاردی دەست بکەوێ!" جەبار مل بۆ پاڕانەوەو لاڵانەوەکانی حەسەن نادات, بەڵام خاوەن قەرز داوای قەرزی خۆ دەکەن، مناڵەکانی برسین... عەرەبانەکەی شکاوەو پێویستی بە چاککردنە، چۆن دوای خەیاڵ بکەوێ! بەڵام چ بکات... هەژاری تاوانە، هەژاری کوفرە، هەژاری بارێکی قورسە، نەك هەر لەسەر شانی داك و باب، بەڵکو کوێرەوەرییە بۆ مناڵانیش. مناڵەکانی لە مەکتەبدا مایەی گاڵتەپێکردنی هاوپۆلەکانی خۆیانن، بابیان هەژارە، عەرەبانچییەکی داماوە... لەبەر هەژاری لە دەرسی تایبەتی مەحروم دەبن، ئیدی چۆن دەربچن؟

بە هەر حاڵ حەسەن جارێکی دیکەش جەبار دەبینێ، باسی گەنجینەی ژێر زەوی بۆ دەکات. جەبار گوێی ناداتێ و پێی دەڵێ: (تۆ مێشکی خۆت بەم تورەهاتە تێك داوە) ئیدی بەجێی دێڵێ و بە دووی رزق و رۆزی خۆی دەکەوێ. عەرەبانەکەی لە ژێر سێبەری دارێکدا بەجێی دێڵێ و دەچێ پاکەتە جگەرەیەك بکڕێ. لەو کاتەدا کە خەریك بوو پارەکەی بدات، گوێی لە دەنگی ئستۆپێکی توند بوو.

جەبار ئاوڕی بۆ لای دەنگەکە دایەوە. چ ببینێ! ئەسپە لەڕەکەی لە عاردی کەوتبوو و بە دەم دوا هەناسەوە لەقەفرتێی بوو. ئومێدی ژیان و تاقە سەرچاوەی رزق و رۆزی لە خوێنی خۆیدا دەگەوزی. ئۆتۆمبیلێکی مەرسیدسی جوان لە نزیکی ئەسپەکە وەستابوو. ئەو لێی دابوو. زەلامێکی قەڵەوی ورگن و بێباك دابەزی. گوێی بە ئەسپەکە نەدا، چوو بە وردی تەماشای ئوتومبیلەکەی بکات تا بزانێ رووشاوە یان نا؟

کابرای قەڵەو لە جەبار نزیك دەبێتەوەو بەسەریدا دەبۆڵێنێ: "ئەمەت پێ باشە خوێڕی... سەیارەکەم رووشا... چۆن ئەو عەرەبانەیە بە تەنیا لەوسەر جادەیە بەجێدێڵی؟".

جەبار دوا نیگای ئەسپەکەی دەکات، شێت و هار دەبێ، پەلاماری کابرا دەدات و هاواری بەسەردا دەکات: "ئەوە چ دەڵێی سەگی سەگباب... ئەسپەکەت کوشتووەو هێشتاش باسی رووشان و بۆیە دەکەی شەرم ناکەی؟!

بە هەر حاڵ مەلەسەکە دەگاتە پۆلیس و دادگا، دیارە دادگا پشتیوانی لە کابرای دەوڵەمەند دەکات و جەبار نەك هەر هەقی ناپرسرێ، بەڵکو بەر دەمرێژی جنێوانیش دەدرێ: "بێگەدەنگ بە خوێڕی.. ئێوە سەرچاوەی هەموو پۆخڵەواتێکن... ئێوەی... کەی لە دەست ئێوە رزگار دەبین؟..."

جەبار، کەلاکی ئەسپەکەی بەجێدێڵێ و بە نائومێدی بۆ ماڵی خۆی دەگەڕێتەوە. چی بە خێزانەکەی بڵێ؟ دەبێ پارە پەیدا بکات بۆ بژێوی خێزانەکەی. دەبێ قەرزی خەڵکی بداتەوە. بەڵام چۆن؟

ئێواری راوێژ بە ژنەکەی دەکات کە چۆنە لە دەرگای ماڵی ئاغای گوند، ئەو ئاغایەی کە جاران کاری لەلا دەکرد، بدات؟ چۆنە بچێ بۆ لۆکە چنین؟.. بە هەر حاڵ ئاغا دەریدەکات! جەبار لە کار دەگەڕێ، هەر کارێك بێ. کاری دەست ناکەوێ. کەلوپەل و ناو ماڵەکەی، تەنانەت دەمانچەکەشی، بەڵام کەس لێی ناکڕێ. بۆیە دەمانچەکەی بە ئەسپایی دەپێچێتەوەو دەیخاتەوە گیرفانی. لەو کەین و بەینەدا دزێکی کارامە دەیبینێ، دوای دەکەوێ، لە دەرفەتێکدا دەست بۆ گیرفانی جەبار دەبات تا دەمانچەکەی بدزێ. بۆ نەگبەتی جەبار پێدەحسێت و کابرا دەگرێ، بگرە کوێت دێشێت.. پاشان جەبار بیردەکاتەوە کە ئەو هەموو توندوتیژییە لە پای چی؟ کابرا بەرەڵلا دەکات و بەنا ئومێدی بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، سەیر دەکا هەموو دەرو دراوسێ لە دایکە خەمینەکەی خڕبوونەتەوە، تومەز خاوەن قەرزەکان عەرەبانەو ئەسپەکەیان بردووەو لە بری قەرزەکانیان مەزاتی بکەن. جەبار بە پەلە بەرەو بازاڕ دەچێت و رووبەڕووی خاوەن قەرزەکان دەبێتەوە: "چۆن زات دەکەن ئەسپ و عەرەبانەکەم بفرۆشن؟" زۆر بە توندی وەڵامی دەدەنەوە کە پیاوبوای و قەرزی خەڵکیت داباوە تا ئەمەمان لەگەڵ نەکردبای.. جەبار, دەستی لە بنی هەنباوە دەرچوو. سەری خۆی هەڵگرت لە مەیخانەیەك گیرسایەوە لەوێندەر بە رێکەوت حەسەن دەبینێتەوە! ئیدی بە دەم چاك و خۆشی و قسانەوە حەسەن وەزع و حاڵی نالەباری جەبار بە هەل دەزانێ و دەیەوێ قاییلی بکات و بکەونە رێگری و خەڵك رووتەوەکردن: "جەباری برام، ئەگەر بە گوێم بکەی ئەم دەمانچەیەی تۆ دەبێ بە سەرچاوەی رزق و رۆزیمان و پێی خەنی دەبین، ئەگەر بچین بۆ گەرەکی دەوڵەمەندان و بەسەر ماڵەکانیاندا بدەین.. دەڵێی چی؟! دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر جەبار چار ناچار تەسلیم دەبێ. لەگەڵ خۆراوادا، بە دوو قۆڵی خۆ بە گەڕەکێکی دەوڵەمەنداندا دەکەن و لە سووچێکی تاریکدا خۆ

دەشارنەوەو چاوەڕوانی نێچیر دەکەن. دەمانچەکە فیشەکی تێدا نییە، فیشەکی بۆچییە؟ ئەوان قەناعەتیان وایە کە دەوڵەمەندان حیزەڵەو ترسنۆکن، هەر کە دەمانچەیان لێ دەربێنی زراویان دەتۆقێ و خێرا بەرکت بۆ هەڵدەڕێژن. دوای ماوەیەك جەبار تاقەتی دەچێ و دەیەوێ بڕوات، بەڵام حەسەن رایدەگرێت، لەم کاتەدا قولە رەشێکی ئەمریکایی (خزمەتکارو پاسەوانی دەوڵەمەندێك دەبێ) تێدەپەڕێ. جەبارو حەسەن دەنگی دەدەن، بەڵام کابرای قولە رەش گوێیان ناداتێ، بەڵکە پەلاماریان دەدات... دەمانچەکە لە دەستی جەبار دەلەرزێ، جووتە هاوڕێ دەیانەوێ هەڵێن. بەڵام کابرا بە شەق و زللە دایان دەگرێتەوە. بە هەزار فەلاکەت لە دەستی دەرباز دەبن.

بە هەر حاڵ جەبار مەجبوری شێخ و گەنجینەی شاراوەو حەسەن و دوعاو نوێژ دەبێتەوەو ئەو وەهم و خەیاڵانەش نایگەیەننە هیچ کوێیەك و جەبار لە ئەنجامدا شێت دەبێ و...

بە هەرحاڵ ئەگەر گۆنای تەنیا ئەکتەر یا دەرهێنەر یا سیناریۆنووس، یا رۆماننووس یان فیلمساز بووایە بۆ خۆی بەڵگەی بەهرەیەکی ناوازە بوو، بەڵام کە لە یەك کاتدا خاوەنی ئەو هەموو بەهرەیە بوو، ئەوە بۆ خۆی دیاردەیەکی دەگمەن و سەر سووڕهێنەرە لە مێژووی هونەردا.

بەهرەمەندی گەورە هەرگیز بابەتی لێنابڕێ، بۆیە کە لە کارێك دەبێتەوە خێرا بیر لە کارێکی دی دەکاتەوە، دەست بە کارێکی دی دەکات تا ئەو بۆشاییانە پڕ بکاتەوە کە لە کاری پێشوویدا بۆی پڕ نەکراونەتەوە. رەنگە فیلمی ئومێد تینویەتی گۆنای نەشکاندبێ، بەڵام یەکەم پەیڤی ئەو بوو، بۆیە دوو ساڵی 1970- 1971، لە ژیانی سینەمایی گۆنایدا، وەرچەرخان بوو، شۆڕەتی ناوخۆو دەرەکی پێ بەخشی، هانیدا کە بە جۆش و خرۆشێکی زیاترەوە کار بکات. ئیدی دەست بەکاربوو.

بە رۆژ وێنەی فیلمێکی دەگرت، بەشەو سیناریۆی فیلمێکی دیکەی دەنووسی. لە ماوەی دوو ساڵێکدا نۆ فیلمی جددی بە تاقی تەنیا بەرهەم هێنا، هەر خۆی دەرهێنەرو ئەکتەرو سیناریۆنووس بوو لەیەك کاتدا، ئەمە جگە لەوەی کە دەوری سەرەکی لە بیست فیلمی دیکەدا بینی، هەندێ لە فیلمەکانی ئەم قۆناغەی بریتین لە: هەلاتووان، نائومێدان، ستەم، شیوەن، باوك... شیوەن یەکێك بوو لەو فیلمانەی لەمیهرەجانە جیهانییەکاندا تەقدیرێکی زۆر کراو بەڕاستی دەنگی دایەوە، لە تاران لە ساڵی 1974، لە تاشقەند لە ساڵی 1976، هەروەها لە ساڵی 1972دا لە میهرەجانی بوندوقییەدا، خەڵاتی رەخنەی جیهانی وەرگرت. لە ساڵی 1977دا لە پەراوێزی کارەکانی میهرەجانی جیهانی سان ریمودا، وەکو رێزو قەدرزانی بۆ گۆنای یەك هەفتەی تەواو کارەکانی یەڵماز گۆنای لێدران، لەو هەفتەیەدا بینەران و میوانانی میهرەجانی نێوبراو ئەو فیلیمانەیان بینی: ئومێد, شیوەن, ستەم, باب, هاوڕێ, نیگەرانی.

لەساڵی 1971داو، لە فیستیڤاڵی ئەزەنەدا بەسێ فیلمی: ستەم, شیوەن و نائومێدان بەشداری کردو سێ خەڵاتی یەکەمی وەرگرت و گۆنای بەخۆیشی بە باشترین دەرهێنەرو سیناریست لە قەڵەم درا, هەروەها بەباشترین ئەکتەر, لە دەوری پیاوان دا, دەرچوو. هەر لەو ساڵەدا رۆمانە بەنێوبانگەکەی (ماتوا واعناقهم ملویە) بۆ یەکەمجار بە تەواوی و بێ نوقسانی لەلایەن وەشانخانەی دۆست-ەوە چاپ و بلاوکرایەوە.

هەڵبەتـە رازی ئـەم سـەرکەوتنە بـێ وێنانـەی گۆنـای دەگەڕێتـەوە بـۆ پیشـاندانی ئـەو بابەتـە راستەقینانەی کە لە واقیعی ژیانی رۆژانەی ناو تورکیاوە، بە تایبەتی بەشی رۆژهەڵاتی تورکیا، کە دەکاتە کوردستان وەرگیراون، ئەمە جگە لە بلیمەتی گۆنای لە ئەنجامدانی رۆڵەکانیدا، جا لێرەدا با بەخێرایی چاوێك بەو سێ فیلمەدا بگێڕین کە لـە سـاڵانی هەفتایـەکانی سـەدەی بیستـەمدا خـەڵاتی یەکەمی تورکیایان وەرگرتووە.

بۆ وێنە فیلمی شیوەن، دیمەن و رووداوەکانی لەسەر سنووری نێوان تورکیاو سوریایە، لـە ناوچـە شـاخاوییەکانی کوردسـتاندایە، هـەر پێـنج قارەمانەکـەی خـەڵکی جووتیـاری هـەژارو دەسـتکورتن، ناچارو بۆ وەدەستهێنانی بژێوی خۆیان پەنا دەبەنە بەر قاچاغ و قاچاغچێتی. دەرهێنـەری فیلمەکـە لـە رێگـەی وێنـەگرتنی رووداوەکانـەوە، رادەی پاشـکەوتووی ناوچـەکەو خـەڵکی ناوچـەکە پیشـان دەدات، زیـاد لـە جارێـك ئامـاژەی بـۆ بـوونی سـوپایی بـەردەوام لـەو ناوچـانەدا کـردووە کـەخۆی لـە خۆیدا هۆیەکە لە هۆیەکانی نا سەقامگیری لەو دەڤـەرەدا، هـەروەها ژیـانی ئـەو خەڵکـە سـاکارانەمان پیشـاندەدات کـە بـوون بـە قوربـانی چەوسـاندنەوەی نەتـەوەیی و سـتەمی کۆمەڵایـەتی، گۆنـای لێهاتووانە پەیامی فیلمەکەی گەیاندووە کە بریتییە لە ریسواکردنی واقیعی نالـەباری ئەو خەڵکەو چەوسـاندنەوەی راسـتەوخۆیان و بـە جورئەتـەوە پـەردەی لەسـەر ژیـانی نالـەباری ئـەو دەڤەرانـە هەڵداوەتەوە..

لە فیلمی ستەمدا گۆنای پەردە لەسەر ئەو کارەسات و ماڵوێرانیانە دادەماڵێ کە لـە داب و نـەریتانی کـۆن و پاشـکەوتوو دەکەونـەوە، لـە کوردسـتاندا (باشـووری رۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ) سـاڵانە دەیـان خەڵکی بێتاوان دەبن بە قوربانی دابی نالەباری تۆڵە کردنەوە...

قارەمـانی فیلمەکـە (جیجـك عـەلی) پـازدە سـاڵی تەمـەنی، لـە ئەنجامی مەسـەلەیەکی خوێنداریـدا لـە زیندان بەسەر دەبات. کە لـە زینـدان بـەر دەبـێ زۆر بـە زەحمـەت دەتـوانێ جارێکی دی بـوونی خـۆی وەکو پیاوێکی باش لە ناو خەڵکی گوندەکەیدا بسـەلمێنێ. عـەلی جیجـك بـە دڵ و بـەگیان دەکەوێتـە خزمـەت و یاریـدەدانی کەسـوکارو ماڵبـاتی کەسـە کوژراوەکـە، کـە خـەڵکی دەبـینێ ئامۆژگارییـان دەکـات واز لـە دابـی نالـەباری تۆڵـە و تۆڵـە ئەسـتێنی بێـنن و ئـەو هەڵەیـەی وی دووبـارە نەکەنـەوە، چـونکە ئـەو هێشـتا هەسـت بـە ئـازاری دەروونـی دەکـات و زۆر پەشـیمانە کـە خـوێنی مرۆڤێکـی بێتاوانی رشتووە.

بـە هـەرحاڵ ئـەنجامی عـەلی جیجـك بـەوە دەشـکێتەوە کـە ئـاگر لـە بـەروبوومی ماڵبـاتی کوژراوەکـە بەردەبێ، دەچێتە یارمەتییان کە ئاگرەکەیان لەگەڵدا وەکوژێنێ، لە ئەنجامی سووتانی دەموچاویدا کوێردەبێ و ئەو ماڵەش دەستبەرداری دەبن و بە تەنیا لە برسانداو لە گۆشەگیریدا دەمرێت.

دەرهێنەر بە شێوازێکی هونەری بەرز ئەو حەقیقەتە بەرجەستە دەکات کـە لـەم جـۆرە کۆمەڵگایانـەدا یەکسانی و داد بەدی نایەن و پاشکەوتن و هەژاری دوو دژمنی سەرسـەختی گـەلن و دەبـێ بـە هـەموو شێوەیەك بەربەرەکانی بکرێن..

لـە فیلمـی نائومێدانـدا، گۆنـای بەوپـەڕی جورئەتـەوەو بـە تـاقی تـەنیا، دەیـەوێ بابـەتێکی هـەرە هەستیار، بابەتی مافیای تورکی بە شێوازێکی هونـەری بخاتـەڕوو و ریسـوای بکـات، دیـارە مافیـای

تـورکی زادەی گـەلێك لـە خڵتـەو خاشـە کۆمەڵگەیـە، وەك: نایەکسـانی، بێـدادی کۆمەڵایـەتی، گەندەڵی و داوەشینی ئـەخلاق لـە داموو دەزگا دەوڵـەتی و پۆلیسـییەکان هـەموو ئەمانـە لـە فیلمـی نـا ئومێدانـدا پیشـان دراوە، (فـورات) قارەمـانی فیلمەکەیـە، گۆنـای بـە خـۆی دەورەکـەی دەبـینێ، رێبەراتی مافیای سەرانسەری تورکیا دەکات، تاقە دۆستی ئەمینی، تەنیا دەمانچەکەیەتی.

گۆنـای، دوای ئـەو فیلمانـە، بـوو بـە دەرهێنـەرو ئەکتـەرو سیناریسـتی بـێ هـەڤرکی ناوەنـدە هونەرییەکەو ئەستێرەی کەوتە بەرزی.. دیارە ئەم سەرکەوتن و شۆڕەتە کەم وێنەیە دەسەڵات و حکومەتی تەواو نیگەران کرد، ئەمە جگە لەوەی کە حکومەت بە وابەستەگی نەتەوەیی و هەڵوێستە شۆڕشگێڕییەکانی و بایەخدانی بەگرفتی هەژاران، بە تایبەتی هەژارانی کورد قەڵس و ناڕەحەت بوو. ئیدی ئەم هونەرمەندە بلیمەتە بەرەبەرە بوو بە دژمن لەلای حکومەت، زۆرجار بەبێ هیچ هۆیەك بۆ لێپرسینەوە بانگ دەکراو چەندین رۆژ هاتوچۆیان پێدەکرد... زۆرجار ئامۆژگارییان دەکرد کە بڕوات و ولات بەجێ بێڵێ... یان زۆرجار پۆلیس هەڕەشەی کوشتنی راستەوخۆیان لێدەکرد: لە ناوەندی شەقامدا وەکو سەگ دەتتۆپێنن، بێ ئەوەی کەس بزانێ کێ کوشتووتی.

گۆنای لەوە بوێرتر بوو ئەو هەڕەشانە لە کارەکەی دووری بخەنەوە، زۆر زیرەکانە هەڵس وکەوتی دەکرد، بە شێوەیەکی یاسایی رەفتاری دەکرد.. دەوڵەمەندەکان دەیانویست گۆنای بێننە ریزی خۆیانەوەو رێگەی ئەوان بگرێتەبەر، بەڵام هەرگیز ئەوەی نەکرد.. بە تاقی تەنیا رووبەڕووی رژێمی تورکی دەبووەوە. بە خۆی لە مبارەیەوە دەڵێت: "ناکۆکی من لەگەڵ دەسەڵاتدارانی حکومەتدا لەو کاتانەوە دەستی پێکرد کە کەوتمە نووسینی کورتە چیرۆکان، واتە لە ساڵی 1956ـەوە.

ئا بەمجۆرە جموجۆڵ و ژیانی تایبەتی گۆنای خرایە ژێر چاودێری، ماڵەکەی لەلایەن بەکرێگیراوانی دەوڵەتەوە چاودێری دەکرا، ئیدی پیلانێکی بۆ رێکخراو حکومەت بەوە تاوانباری کرد کە گوایە یارمەتی قوتابییە ئاژاوەگێڕەکان دەدات و لە ماڵەکەی خۆیدا داڵدەیان دەدات. ئەمەش بیانوویەکی باش بوو بۆ حکومەت کە لە 1971/3/17دا بیگرێ و بە قەرارێکی لام سەرلایی دادگا بۆ ماوەی دە ساڵ زیندانی بکرێ.

بەڵام فاشیستان ئەمجارەش بە هەڵەدا چوون و گۆنای لەو کەسانە نەبوو بە ئاسانی بێدەنگ ببێ یان بێدەنگ بکرێ و مل بۆ ویستی زۆرداران کەچ بکات. خۆشبەختانە دەنگی ئازاد نایەتە خنکاندن و بە ئاستەم دەرفەتی بۆ بڕەخسێت، شێوازی دەربڕینی خۆی دەدۆزێتەوە. ئەوەتا لە نامەیەکیدا بۆ فاتیمەی هاوسەری، کە لە زیندانی سەلیمیەوە، لە 1973/4/1دا ناردوویەتی دەڵێت: "ئەمڕۆ یەکی نیسانە، رۆژی لە دایك بوونمە... هێشتا ئەو رۆژانەمان لە بەردەمدایە کە نەمان گوزەرانـدووە، رۆژانی پڕ لە ئازارو کوێرەوەری... کێ دەزانێ ئەو رۆژانە چەندیان ماوە؟ من هەرگیز بۆ خۆم نەژیاوم، لە ژیانمـدا لـە هـیچ شـتێك نەترسـاوم.... مـن دەزانم چ کارەسـات و دەردی سـەرییەك چاوەڕوانمە، بەڵام وێڕای ئەمەش دژی دژمنی خۆ دەخەبتین... سبەینێ هی ئێمەیە، ئێمە دەمرین، بەڵام منداڵەکانمان لە دوای ئێمە دێن و بەری ئەم خەباتە دەخۆن و دەی پارێزن، هەست بەترس ناکەن... رۆژێ دێ بەسەر چەوسانەوەو ترس و تیرۆردا زاڵ دەبین... بە زەبری بیروباوەڕی گەورەو بتەومان بەسەر ئەم زوڵمە دڕندانەیەدا سەر دەکەوین، ئەو رۆژە هەر دێت.. ئەوان بە تەمان

زیندانیکردنی مرۆڤێك لە نێو چواردیواری بەردینی شێداردا، کۆتکردن و بەندکردنی لە قەفەزی ئاسنیندا، وەی پێ بەردەدا، ناچاری دەکات بابداتەوەو بیروبۆچوونی خۆی بگۆڕێ، بەلأم خەیاڵیان خاوە، نازانن کە ئەمە مەحاڵە... غافڵن لەوەی کە دەرگا ئاسنەکان و کۆتە پۆلاییەکان، هەر دەبێ بشکێن."

بەلأم گۆنای، پیاوی تەنگانە بوو، پیاوی هەڵوێست بوو، رۆژ لە دوای رۆژ پتر بیروباوەڕی مرۆڤپەروەرانەی دەخەملی و دەچەسپی و هەموو لاوی و ژیانی خۆی بۆ سەرەتا مرۆڤانییە بەرزەکانی، بۆ ئازادی گەلەکەی و هەموو گەلانی چەوساوەی سەر رووی زەمین تەرخان کردبوو، دڵنیا بوو لەوەی کەرامەت و سەربەرزی بە دەست دێنێ و ئەوەش بۆ کەسایەتییەکی وەکو ئەو بەس بوو.

گۆنای، لە کاتێکا بەنیاز بوو فیلمێکی تازە دەربێنێ، جارێکی دی رەوانەی زیندان کرایەوە، بەلأم گۆنای کۆڵی نەدەدا، دوای دوو مانگ پاش زیندانیکردنی، رۆمانە بە ناوبانگەکەی (ماتوا واعناقهم ملویە) خەلأتی ئۆرهان کەمالی ئەدەبی وەرگرت و لە بەر گرنگی داهێنانە ئەدەبییەکانی نازناوی باشترین کەسایەتی هونەری وڵاتی وەرگرت. هەروەها لە ئەیلولی ساڵی 1972دا، خەلأتی قۆزاخەی زێڕینی فیستیڤاڵی سینەمای سەرانسەری تورکیای لەشاری ئەزەنە وەرگرت، ئەم خەلأتەی لەسەر فیلمی (باوك) وەرگرت.

حکومەت، ئەنجامی فیستیڤاڵەکەی بەدڵ نەبوو، بۆیە لیژنەی هەڵسەنگاندنەکە ناچار کرا لە قرێرەکەی خۆی ژێوان ببێتەوەو خەلأتی یەکەم بدات بە فیلمی (کارا دۆغان) و نازناوی باشترین ئەکتەر بدات بە جونیت ئەرکان. بەلأم جونیت ئەرکان ئەو قەرارەی رەفز کردو خەلأتەکەی وەرنەگرت و بە رۆژنامەوانی راگەیاند کە: "ئەمە کارێکی نا بەجێیە، بە چ هەقێك خەلأتەکە لە گۆنای وەربگیرێتەوەو بدرێ بە من. من ئەمە بە سووکایەتی بۆ خۆم دەزانم نەك بە شانازی.... منیش پێم وایە گۆنای مستەحقتری ئەو خەلأتەیە..."

هەڵبەتە خەڵکانێکی زۆر لە نووسەران و هونەرمەندان ئەو بڕیارەیان مەحکوم کردو دژی وەستانەوە. مەسەلەکە لە ئەنجوومەنی نەتەوەیی تورکیادا مشتومڕو گەنگەشەی زۆری نایەوە. تەنانەت بلند ئەجاویدی سەرۆکی حیزبی گەلی کۆماریش دژی قەراری ناوبراو وەستا.

بە هەر حاڵ سەرکەوتنەکانی گۆنای، تەنیا سەرکەوتنی ناوچەیی نەبوون، بەڵکو مایەی سەرنجی هونەرمەندە جیهانییەکانیش بوو، لە هەمان ساڵدا، هەردوو فیلمی ئومێدو شیوەن-ی لە هەندەران پیشاندران و سەرکەوتنی زۆر گەورەیان بەدەست هێنا. تورکیا بۆ یەکەمجار لە مێژووی سینەمایی خۆیدا بە فەزڵی فیلمی شیوەن لە میهرەجانی بوندوقییەدا بەشداری کردو ئەم فیلمە زۆر بە گەرمی لەلایەن جەماوەرەوە پێشوازی کرا، ئەو جەماوەرەی بەدەم هو راکێشانەوە داوای ئازاد کردنی گۆنای و مەرگی فاشیزمی دەکرد.

سەرکەوتنەکانی گۆنای لە هەردوو ئاستی ناوخۆو دەرەوە، بە تایبەتی کە گۆڤاری هونەری "مللییەت" بە رەسمی رایگەیاند کەساڵی 1972 ساڵی گۆنایە، ساڵی سەرکەوتنی گۆنایە, حکومەتی زۆر قەڵس و نیگەران کرد. چونکەحکومەت دەیزانی کە گرتنی خۆشەویستی جەماوەر

کارێکی قورسەو جەماوەر بە تەواوەتی هەستاوەتە سەر پێ و بەرگری لە گۆنای دەکات، گۆڕانی پێدا هەڵدەڵێ. جا گرتنی یەڵماز گۆنای تەنیا پێشکەوتوخوازانی تورکیای سەخڵەت نەدەکرد، بەڵکو لە هەر چوار نکالی دنیاوە پشتیوانی لێدەکرا، پاش ئەوەی کە گیرا بە ماوەیەکی کەم ناودارانی سینەمای جیهانی و هونەرمەندانی پێشکەوتوخوازی ئەوروپا یادداشتنامەیەکی نارەزاییان دا بە رژێمی تورکیاو داوای ئازادکردنیان کرد. حەوت کۆمپانیای سینەمایی و سەندیکای شانۆکاری لە وڵاتانی سویدو ئەڵمانیای رۆژاوا ئەم یادداشتنامەیەیان ئیمزا کرد، ئەمە جگە لە لە ئیمزای 156 هونەرمەندی بواری شانۆو سینەمای جیهانی.

گۆنای نووسەرو هونەرمەند دوو ساڵ و نیو لە زیندانی سەلیمیەی جەنگیدا مایەوە. دیارە گۆنای ئەم دوو ساڵە بە بەدترین ساڵانی تەمەنی خۆی دەزانێ. کتێبێکی تایبەتی بە ناوی (ژوورەکەم) لەسەر خەم و پەژارەو کول و کۆڤان و تورەیی ئەو ماوەیە نووسیوەو داخی خۆی تێدا هەڵڕشتووە. هەروەها لەو نامانەشدا کە لەو زیندانەوە بۆ فاتیمەی خێزانی نووسیوە، ئەو بارودۆخە نالەبارەی ناو زیندانی سەلیمیەی عەکس کردۆتەوەو نیشانی داوە. ژمارەی ئەو نامانەی 177 نامەیەو لە کتێبێکدا بە ناوی (کۆمەڵە نامەیەك لە سەلیمیەوە) کۆکراوەتەوەو یەڵماز پێشەکییەکی بۆ نووسیوەو لە ساڵی 1975دا چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

بە هەر حاڵ یەڵماز لە ئایاری ساڵی 1974 لە زیندان دەرچوو. بە رۆژنامەوانانی راگەیاند کە: "مانەوەم لە زینداندا بەشێکە لە خەباتی کۆمەڵایەتیم... ئەرکی ئێستام بریتییە لە دانان و دەرهێنانی فیلمێن تازە."

هەر واش بوو هەر کە لە زیندان هاتە دەرێ کەوتە کارکردن، ئەوە بوو فیلمی (هاوڕێی) بەرهەمهێنا، سیناریۆی ئەم فیلمەی لە زینداندا نووسیبوو. بابەت و نێوەڕۆکی ئەم فیلمە لە چاو سینەمای تورکییەوە زۆر تازە بوو. بریتییە لە مالیجەی دۆزو مەسەلە پەروەردەیی و رووحییەکانی ژیانی رۆشنبیران لە تورکیادا، کۆبوونەوەو گەنگەشەی توندی نێوان قوتابیان و لاوان زۆر بە روونی ئەو مەسەلانە بەرجەستە دەکەن و تەمەشاڤان هەست بەو گۆڕانە چاوەڕوانکراوانە دەکات کە کۆمەڵگە پێیان ئاوسە. فیلمەکە ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن دوو هاوڕێ لە زانکۆدا، دوو هاوڕێ کە هەردووکیان لە دوو ماڵباتی جووتیاری دێهاتی هەژارن، لە کاتی خوێندکاریدا لە یەکترەوە نزیك بوون، بیروبیرکردنەوەیان وەکو یەك بووە، بەڵام پاش تەواوکردنی زانکۆ، لێکدی دادەبڕێن و گۆڕانی گەورە بەسەر ژیان و بیروبۆچوونی دوو هاوڕێیەکەدا دێت. عەزیم کە دەکاتە یەڵماز گۆنای، و جەمیل کە دەکاتە کەریم ئەفشار. جەمیل وەزعی باش دەبێ و تەنیا پارەو رابواردنی بەلاوە گرنگەو گوێ بە هیچی تر نادات. بەڵام عەزیم وەکو جاران دەمێنێتەوە، هەموو ئامانجێکی لە ژیاندا ئەوەیە خزمەتی مرۆڤایەتی بکات و بایەخ بە گیروگرفتەکانی گەل بدات و ببێ بە شەریکی خۆشی و ناخۆشی خەڵکی.

عەزیم دەیەوێ هاوڕێکەی بێنێتەوە سەر رێگەی راستی و زۆری هەوڵ لەگەڵ دەدا. بەڵام بێهودەیە، جارێکیان لە موقەشەیەکدا ژنی هاوڕێکەی بە بەرچاوی جەمیلی مێردییەوە زللەیەك لە عەزیم دەدات... ئیدی عەزیم بۆی دەردەکەوێ کە هاوڕێکەی لە دەست داوە. بۆیە هەڵدەستێ و ماڵەکە بە

جێ دێڵێ. دوای وەدەرکەوتنی بە چەند ساتێکی کەم لە پشت شاشەوە دەنگی تەقەیەك دەبیسترێ کە ئاماژەیە بۆ لێکدابڕانی یەکجارەکی ئەو دوو هاوڕێیە.

یەڵماز گۆنای بەشێوەیەکی هونەری باڵا دەری بڕی کە چۆن دوو بۆچوونی جیاواز سەبارەت بە ژیان ئامبازی یەکدی دەبنەوە، بۆچوون و روانینێکی مرۆڤانی نەمر، و بۆچوون و روانینێکی گەندەڵی مردوو...

ئەوەی مایەی سەرنج بوو گۆنای یەجگار سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی کارو پرۆژە هونەرییەکانی، لە تۆ وایە هەست بەوە دەکات کە زۆر ناژیو فریا ناکەوێ، ئەوەتا لە هەڤپەیڤینێکی رۆژنامەوانیدا دەڵێت: "لە ئایاری ساڵی 1974دا، بەپێی بوردنی گشتی لە زیندانییانی وڵات، لە حەپسخانەی سەلیمیە بەر بووم... لەو ماوەیەدا کە لە زیندان بووم، شەش حیکایەتم نووسین دەربارەی بابەتی جیاواز. یەکێك لەو حیکایەتانە دەربارەی گیروگرفتی رۆشنبیران بوو لە کۆمەڵگەی بۆرژوازیدا – مەبەست لە حیکایەتی فیلمی هاوڕێیە– بەڵام حیکایەتی دووەم، کە یەکسەر دوای فیلمی هاوڕێ دەستم بە وێنەگرتنی کرد، چیرۆکی فیلمی نیگەرانییە... دەمویست لەم حیکایەتەدا، ژیانی ئەو وەرزێرە کوردانە پیشان بدەم کە خەریکی لۆکەچنی بوون... هەموو قارەمانانی فیلمەکە کوردن. هەروەها فیلمەکە لە ناو سروشتدا وێنەگیراوەو لە ستۆدیۆدا کاری بۆ نەکراوە.... بەڵام وەکو دەزانن نەمتوانی بەخۆم فیلمەکە تەواو بکەم، بەهۆی ئەو بوختانەوە کە حکومەتی کۆنەپەرست بۆی هەڵبەستم گوایە دادوەرم کوشتووە... بە هەر حاڵ ئەوە چیرۆکێکی دوورو درێژە..."

رووداوێن فیلمەکە لە ژینگەیەکی واقیعیدا روو دەدەن, هەر کەسێك فیلمەکە بدینێ. چ کوردبێ چ کەسێك بێ کە کوردبناسێ و لەگەڵ کوردا ژیابێ, دەزانێ کە ئەم کارە فیلمێکی تەواو کوردییە, جگە لە زمانەکەی, چونکە زمانی کوردی لە تورکیادا قەدەغەیە!..

بەهەر حاڵ بابێینەوە سەر رووداوی کوشتنی کابرای دادوەر. لە سەرەتای پایزی ساڵی 1974دا, یەڵماز گۆنای پاش ئەوەی لە وێنەگرتنی فلیمی (هاوڕێ) دەبێتەوە, لە گەڵ گرووپی وێنەگرتندا دەچێت بۆ (یومورتالی) سەر بەشاری ئەزەنە, تا دەست بە وێنەگرتنی فیلمی( نیگەرانی ) بکات, لە شەوی 14ئەیلول دا و پاش ئەوەی لە وێنەگرتنی هەندێ دیمەنان دەبنەوە , یەڵماز بڕیار دەدا کە لەگەڵ گرووپەکەی خۆیو ژنەکەیو عەبدوڵلا بوتون–ی خوارزایدا نانی ئێوارە لە گازینۆکەی ئەو گوندە کە کەوتبووە سەر دەریا بخۆن. سەفا موتلۆ، کە نوێنەری گشتی شار بوو، لەگەڵ چوار پیاوی خۆیدا، رێك لەو کاتەدا لەوێندەر بوونو شیویان دەخوارد، کاتێ گۆنایو هاوکارەکانی وەژوور کەوتن، نوێنەری گشتی دەکەوێتە گاڵتە پێ کردنیو، هەڕەشەی لێدەکاتو تەوسی پێدەکات: :چەند لووتبەرزە، هەر سەلامیش ناکات... پاشای شاشەیە ها؟... منیش پاشای ئەم دەڤەرەم... لە هەر شوێنێ بم، دەبێ هەمووان گوێڕایەڵم بنو کڕنۆشم بۆ بێنن... ئەگەر ئەمەیان بە دڵ نەبێ بابڕۆن بۆ شوێنێکی دیکە...، بە هەر حاڵ بەدەم دەمرێژی جنێوو قسەی ناشیرینەوە قاقای لێدەدا. کە لە قاقاکەی دەبێتەوە گۆنای خۆی پێناگیرێو وەڵامی دەداتەوە: "پیف لەم نوێنەرە گشتییە" ئەوسا کابرای نوێنەر وەکو ئەوەی بۆ بیانوویەك بگەڕێ، پەلاماری گۆنای دەدا، گۆنای–ش بەرگری لە خۆی دەکاتو بە دەست دەڵەکی دەداتو نوێنەری (مەست) دەکەوێت. بەڵام

زوو هەڵدەستێتەوەو پەلاماری گۆنای دەداتەوە. گۆنای دەمانچەکەی (کە مارکەی بیریتا) بوو دەردێنێ و بۆ ترساندنی تەقەیەك بە ئاسماندا دەکات. کابرای نوێنەریش، دەمانچەکەی دەردێنێ کە تەقە لە گۆنای بکات، کە دەیەوێ پل بە پەلە پیتکەوە بنێ، یەکێك لە گروپەکەی گۆنای شەقێك لە دەستی کابرا دەدات و گۆنای رزگار دەکات. دوو فیشەك دەتەقن، ترس دەکەوێتە نێو دانیشتوانەوە. لەم کاتەدا تەقەی سێیەم دەکرێ، فیشەکەکە بەر چاوی راستی نوێنەر دەکەوێ و مێشکی دیوەودەر دەکات و هەر لەوێ دەمرێ. ئەم فیشەکە، فیشەکی دەمانچەی (ئیدمان) دەبێ، کە بە عەبدوڵلا بوتون دەناسرێ. (کە کابرای نوێنەری گشتی بۆیە دەکوژێ تا خاڵی نەکوژرێ.) ئەوجا هەڵدێ بۆ چیا تا خۆی بشارێتەوە. بەڵام بەیانی زوو، پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر کە رەنگە ئەم کارە دەردی سەرییەکی زۆر بۆ خاڵی بنێتەوە، خۆی تەسلیم بە مەخفەرێکی پۆلیس دەکات و دان بە هەموو شتێکدا دەنێ. وێڕای ئەوەش حکومەت گۆنای بەرنەدا، وەکو ئەوەی لە بیانوویەك بگەڕێ بۆ حەپس کردنی... پاشان عەبدوڵلا بوتون لە حەپسخانەداو بە شێوەیەکی نادیار کوژرا.

بەیانی رۆژی 15/ئەیلولی 1974 پۆلیس یەڵماز گۆنایان گرت، تۆمەتی کوشتنی درایە پاڵ و، یەکسەر درایە دادگا. دادگا 40 کەسی وەکو شایەد بۆ دادگا بانگ کرد، 33 کەسیان بێ تاوانی یەڵمازیان دووپات کردەوە. خاوەنی چاخانەکە وتی کە یەڵمازی دیتووە تەقەی بە ئاسماندا کردووەو نازانێ کێ بکوژی راستەقینەیە. پێنج شایەدی دیکە گوتیان سێ فیشەك تەقێنرا، بەڵام نازانن کێ بکوژە. تاقە کەسێك کە لە دادگادا گوتی یەڵماز بکوژە، فەوزی ئەسلان بوو (کە یاریدەدەری دەستە راستی نوێنەری گشتی بوو) و گوتی: یەڵماز لەگەڵ گروپی وێنەگرتندا بۆ شامکردن نەهاتبوو، بەڵکو هاتبوو تا چەند دیمەنێك بۆ فیلمەکە بگرێ. هەروەها نوێنەری گشتی بۆ خواردنەوە نەهاتبوو بۆ چاخانەکە، بەڵکو بەکاری وەزیفی خۆی هاتبوو، دەقاو دەق بۆ ئەوە هاتبوو کە نەیەڵێ یەڵماز لەو ناوچەیەدا وێنە بگرێ.

ئیدی بەو بیانووە دادگا بە زوڵمێکی زۆرەوە حوکمی 19 ساڵ حەپسیاندا. جا لە ئەنجامی ئەم رووداوەوە گۆنای نەیتوانی فیلمی (نیگەرانی) تەواو بکات و ئیدی بە هاوڕێ و یاریدەدەری خۆی (شەریف گورین)ی دەرهێنەری سپارد، کە زۆر لێهاتووانەو دڵسۆزانە وێنەگرتنی فیلمەکەی ئەنجامدا. دیارە ئەمە یەکەم کارو دوا کاری هاوبەشی نێوان ئەو دوو هونەرمەندە نەبوو.

بەو جۆرە، گۆنای بۆ جاری سێیەم رەوانەی زیندان و بەندیخانە تاریك و نوتەکەکان کرا، تا قۆناغێکی دیکە لە ئازارو ئەشکەنجەی ناو زیندانانی فاشیستان بچەرپێنێ. بەو جۆرەو بە ناهەق 19 ساڵ حوکمدرا. بەڵام یەڵماز لەو کەسانە نەبوو ورە بەربدات یان کۆڵبدات.. لە هەر شوێنێك بوایە درێژەی بە خەباتی خۆی دەدا، شێوازێکی تایبەتی بۆ خەبات دادەهێنا. کارو بەردەوامی کار، بە تایبەتی کاری هونەری رازو نهێنی خۆراگری یەڵماز بوو، بۆیە لە ناو زینداندا پەنای وەبەر چەکی نووسین برد، نووسین بەلای ئەوەوە گونجاوترین چەك. شارستانی ترین چەك بوو بۆ بەرەنگار بوونەوەی ترسنۆکان، ئەوانەی نەیاندەویست خەڵکانێك بە دروستی واقیع بخوێننەوە، حەقیقەتەکانی ژیانی خەڵکی کەشف بکەن، چارەی درێوی هەژاری و زوڵم لە ناو کۆمەڵگەی تورکیدا بخەنە روو... کە لە نووسینەوەی سیناریۆیەك دەبووەوە، دەستی بە نووسینی رۆمانێك

دەكرد، كە لە نووسینی چیرۆكێك دەبووەوە، سەر لە نوێ دەچووە سەر سیناریۆیەكی دی. ئیدی ئەو كارانەی دەنێردرانە دەرەوەی زیندان و دەخرانە سەر شاشەی سینەما، هەڵبەتە ئەمە بە هاوكاری دوو دەرهێنەری هاوڕێی خۆی دەكرا، ئەوانیش هەردوو دەرهێنەر (شەریف گورین)و (زەكی ئوكتان)و هەندێ جار خەڵكانی دیكەش بوون. بۆ وێنە لە ساڵی 1975دا فیلمی (مۆڵەت) كە سیناریۆی گۆنای و دەرهێنانی سینەماكاری ناشی (ئەرتیم كوراج) بوو كەوتە سەر شاشەی سینەماكان. هەر لە هەمان ساڵدا (زەكی ئوكتان) ڕۆمانی (تاوانباران) گۆنای كرد بە فیلمی سینەمایی. لەساڵی 1976دا (بیلجی ئیولكاچ) فیلمی (هەر ڕۆژێك دێت)ی كە سیناریۆی گۆنای بوو دەرهێنا. هەروەها (عاتف یەڵمان) فیلمی (كلۆلان)ی دەرهێنا كە سیناریۆی گۆنای بوو. هەروەها (زەكی ئوكتان) فیلمی (دژمن)ی دەرهێنا كە یەڵماز گۆنای سیناریۆی بۆ نووسی بوو.

هەر هەموو ئەو فیلمانە نەك هەر لە ئاستی توركیادا، بەڵكو لە هەندەرانیش سەركەوتنی گرنگیان بەدەست هێنا. بەڵام هیچیان لە ئاستی (مێگەل)و (ڕێگا)دا نەبوون كە بێ چەندو چوون دوو توحفەی هونەری هەرە گەورەی جیهانی سینەمایی بوون و كەلەپورێكی هونەری و ڕۆشنبیری نەك هەر گەلی كورد بوون بەڵكو هی هەموو مرۆڤایەتی بوون...

بە هەر حاڵ گۆنای لە زینداندا تا ڕادەیەك گۆڕانی بەسەردا هات و هەڵوێستی سەبارەت بە گەلی كوردو دۆزە ڕەواكەی گۆڕا. ئەمجارەیان كوردەواری، گیروگرفتەكانی، كارەساتە نەتەوەییەكانی كورد زۆر بە ڕوونی و ڕاستەوخۆ لە كارە هونەری و نووسینەكانیدا ڕەنگی دایەوەو كوردو كوردستان پانتاییەكی گەورەی لە كارە ئەدەبی و هونەرییەكانیدا، بۆ تەرخانكراوە.

ئەم هونەرمەندە سەرسەخت و بە هەڵوێست و بوێرە بە هەموو شێوەیەك دژایەتی دەكرا، دەوڵەتی توركیا بە ئاشكراو بە زۆر شێوەی جیاواز هەڕەشەی لێدەكرد و گوشاری لێدەكرد تا ناچاری بكات مل كەچ بێ یان لە زیندان هەڵێت و پاشان لە زیندانە گەورەكەی دەوڵەتی توركیا بڕەڤێ و بەرەو هەندەران كۆچ بكات و لە كۆڵیان ببێتەوە. ئەوە بوو پاش ماوەیەك، گۆنای هەر چەندە حەزیدەكرد لە ناوەوەی وڵاتدا بمێنێ و لە نزیكەوە لەگەڵ گەلی خۆیدا بژی و تا دوا هەناسە بۆ ڕزگاری گەل و نیشتمانەكەی بخەبتێ. لە زیندان هەڵات و وڵاتی بەجێ هێشت... كە گەییە هەندەران، لە یەكەم دیمانەی ڕۆژنامەوانیدا لێیان پرسی:

- ئەدی تۆ نەتدەگوت خۆم دەگرم و وڵات جێناهێڵم و لە نێو گەلی خۆمدا تێدەكۆشم؟!

+ هێشتا زۆر زووە كە باسی هەڵاتنەكەم بكەم. من لە پێناوی وەدەست هێنانەوەی ئازادی خودی خۆم هەڵنەهاتووم، بەڵكو لەبەر ئەوە هەڵاتم تا دەرفەتم بۆ بڕەخسێ كە لە پێناوی ئازادی زەوتكراوی وڵاتەكەمدا بخەبتم... پاش ئەوەی دیكتاتۆریەتی فاشی لە 12 /ئەیلولی 1982 هاتە سەر حوكم، لە چەند سەرچاوەیەكی باوەڕ پێكراوەوە هەواڵیان دامێ كە حكومەت خەریكی پیلانێكە بۆ كوشتنم. ئەوسا قەناعەتی تەواوم كرد، كە مانەوەم بە سەلامەتی لە سایەی حكومەتی ئاوهادا مەحاڵە..."

* * *

با بێینەوە سەر پێکهاتەی فیلمی (مێگەل) ئەم شاکارە چەوسانەوەو دواکەوتوویی و ئازاری گەلێك لە میانەی ژیانی خانەوادەیەکی هەڵقولاوی ناو جەرگەی ئەو گەلەوە دەگێڕێتەوە. مێگەل فیلمێکی ناسکە، لە رووی هزرو بیرەوە زۆر قووڵە، لە باری بابەت و ناوەڕۆکەوە دەوڵەمەندە. بیری سەرەکی فیلمەکە برتییە لە داڕوخان و هەرەسهێنانی داب و نەریتی کۆن لە ژێر گوشاری داب و نەریتی هاوچەرخدا.. شێوەی کۆنی ژیانی روو لە نەمانە، بەڵام دەرهێنەر بەو ژیانە تازەیەی تورکیاش رازی نییە، بە راشکاوی ژیانی سەختی شارو چاو برسێتی بازرگانان و گەندەڵی فەرمانبەران و فێڵ دەهۆوی هەزارو یەك توێی بۆرژوازیەت پیشان دەدات. هەروەها لە فلیمەکەدا چیرۆکی ئەڤینییەکی هێدی و گەرم و گوڕ، خەمین و کاریگەریش پیشاندراوە، کە یەکێك لە رەخنەگرانی سینەمایی ئەورووپایی لە بارەیەوە دەڵێت: "ئەمە هەمان ئەشقی نەمری رۆمیۆو جولیتە بە شێوەو شێوازی رۆژهەڵاتی...

ئەم شاکارە هونەرییە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە: لە سەرەتادا ئاشنای ژیانی عەشرەتێکی کوردی دەبین بە ناوی (وایسکان) ئەم عەشرەتە لە ناوچەیەکی شاخاوی دوورە دەستدا دەژی. داب و نەریتی خێڵایەتی خۆی پاراستووە، ئەو داب و نەریتانەی لە پێشینانی خۆوە بۆ ماوەتەوە، لەو نەریتانە: دەسەڵاتی بابسالاری (حەمۆئاغای سەرۆکی عەشرەتە) وردو درشتی ژیان و کاروباری عەشرەتەکەی بەدەستە. هەموو ئەندامانی عەشرەت پابەندی ئەو دەسەڵاتەن و کەس ناتوانێ بە موو لێی لابدات. دژمنایەتی و خوێنداری و تۆڵەو تۆڵەئەستێنی لەگەڵ عەشرەتێکی دیکەی کوردا بەناوی (خەلیلیان).

فیلمەکە بە ئاشکرا ئاماژە بۆ هەرەسهێنانی ژیانی خێلایەتی لە سایەی رژێمی فیودالی – بۆرژوازی باودا دەکات. ئەویش بە ئاماژەکردن بۆ ئەو تراکتۆرانەی کە زەوی دەکێڵن کە خۆی لە خۆیدا هێمایە بۆ سەر هەڵدانی بۆرژوازیەت و سەرمایەداری لە ناوچەکەدا. حەمۆ ئاغا کە رەمزی رژێمی خێڵایەتییە بە رقەوە دەڕوانێتە ئەو ئامێرانەو لە تۆ وایە دەیەوێ بە نیگای تیژی تێك و پێکی بشکێنێ. دەرهێنەر لەلایەکی ترە وەو لە میانەی بیرو بیرکردنەوەو قسەکانی شڤانی کوڕە گەورەی سەرۆك عەشرەتەکەشەوە حەتمیەتی هەرەسهێنانی ژیانی کۆنمان پێ رادەگەیەنێ. شڤان کوڕێکی تۆکمەو دڵپاکە، بە تەواوەتی باوەڕی بە حەتمیەتی گۆڕان هێناوەو ئەوەتا لەگەڵ کابرای چەرچیدا دەئاخڤێ و دەڵێت: ئەم ژیانە بەکەڵك نەماوە. تراکتۆر لە هەموو شوێنان پەیدا بووە.... رۆژ بە رۆژ رووبەری پاوان و لەوەڕگەکان کەم دەبێتەوە... کەواتە گۆڕان بەر دەرکەی پێگرتوون، بەڵام ئەم گۆڕانە چۆن دەبێت؟ شڤان پێی وایە چار ئەوەیە بار بکەن بۆ شارو لەوێندەر کاری بدۆزنەوە، غافڵە لەوەی کە چ یاساو رێسایەکی توند ژیانی شاری کۆنترۆڵ کردووە، هەروەها بەرەبەرەو بەشێوەیەکی زیرەکانە شیرازە پچڕانی پەیوەندییە خانەوادەییەکان–یش دەردەکەوێ، ئەوەتا (سلۆ)ی کوڕە بچووکی حەمۆ ئاغا هەندێ میدال و عەنتیکەی کۆن لە شکەفتێکدا دەدۆزێتەوەو دەیانفرۆشێت و پارەکەی دەشارێتەوەو بۆ خۆی هەڵیدەگرێت و ئەمەش هێمایە بۆ دەرچوون و لادان لە دابی گوێڕایەڵی (هەڵبەتە بەپێی یاسای بابسالاری نەدەبوو بیشارێتەوە، چونکە ئەوە موڵکی هەمووماڵباتەکەیە. یەکەمین هەنگاوە بۆ جیابوونەوەو خۆیبوون. هەڵبەتە پێویستە لێرەدا

ئەوەش بگوترێ کە دیمەنی فرۆشتنی ئەو عەنتیکانە لەلایەن سلۆوە هێمایە  بۆ ئەوەی کەخاکی کوردستان پڕە لەو بابەتە شوێنەوارو عەنتیکانە کە خۆی لە خۆیدا نیشانەی شارستانیەتە، لێ مەخابن لەلایەن بێگانانەوە، لەلایەن داگیرکەرانەوە دەدزرێ‌و بە تالان دەبرێ.

هەر لەم بەشەدا ئاشنای بەها روحییەکانی ئەندامانی خێزانەکەی حەمۆ ئاغا دەبین، بە تایبەتی لە میانەی رەفتارو هەڵس‌و کەوتیاندا لەگەڵ (بیریڤان)ی هاوسەری شڤاندا هەموو هەر دەیبوغزێنن (هەڵبەتە داب‌و نەریتی بابسالاری وا دەخوازێ). چونکە لە خێڵی خەلیلیانی دژمنیانەو لە بری خوێن وەرگیراوە.. جا کارەساتی ئەم بووکە کە یەکەم منالی لەبار دەچێت، قورستر دەبێ... بۆ نەگبەتی منالی دووەم‌و سێیەمیشی هەر لەبار دەچن. بۆیە هەموو ئاغاو خەڵکانێکی دیکەی سەر بە خێڵەکەی دەکەونە گومانێکی شێتانەی نا مەنتیقییەوە. حەمۆ ئاغا لە شڤانی کوڕی دەپرسێت: پێت وایە نەخۆشە؟ ها؟ بەڵام ئەمەشت لەبیر نەچێ کە لەخێڵی خەلیلیانە.. منداڵەکانی خۆی لە بێشکەدا دەکوژێ تا گەورە نەبن‌و دژایەتی خێڵەکەی ئەو نەکەن!... شڤان بە گوێم بکەو دەری بکە، ئەمە دژمنە دژمن... مەحاڵە خێر بۆ ئێمە بداتەوە..

ژارۆ شڤان، هیچ چارێکی نییە، منداڵەکانی لەبار دەچن. ژنەکەی لە ئەنجامی لەبار چوونی منداڵەکانی زمانی دەبەستری. زیارەتی مەزارو دوعای پیاوانی ئاینی دادی نادات. چار چییە؟ شڤان لەبەر خۆیەوە: تۆ بڵێی بابم راست بکات، ماقووڵە ئەم ژنە منالەکانی خۆی بکوژێ؟! نەخێرو هەزارجار نەخێر، شڤان بۆ یەکەمجار بە رووی بابیدا هەڵدەشاخێ: نەخۆشە نەخۆش باوکە... گوناحە وا بیر دەکەیەوە.. چۆن دەچێتە ئەقڵەوە ژنێك بە ئانقەست منالی خۆی بکوژێت؟ پێویستی بە دکتۆرە باوکە... نەخۆشە.. نەخۆش."

بەم شێوەیە شڤان لێدەبڕێ کە پشتی بیریڤان بەر نەدات. ئەم دوو کلۆڵە وێڕای ئەو وەزع‌و حاڵە نالەبارەیان، ئەڤینێکی راستگۆو بەهێز پێکیانەوە دەبەستێ... ئەمەش لەو کاتەدا دەردەکەوێ کە براکانی بیریڤان داوای لێدەکەن لەگەڵیاندا بچێتەوە تا یارمەتی بدەن‌و بیبەنە لای دکتۆر، کەچی بیریڤان لەگەڵیاندا ناچێ، بە بێدەنگییەکی سامناك، نیگای خەمین‌و پڕژانیان تێدەبڕێ، وەکو ئەوەی پێیان بڵێ من موڵکی خۆم نییە، بەڵکو بوون‌و هیوای ژیانم لەوێندەرە، ئاوڕ بۆ لای شڤان دەداتەوەو بەرەو پیری رادەکات‌و خۆی لە پشتییەوە مەڵاس دەدات. شڤانیش پیاوانە گوزارشت لەو ئەڤینە راستگۆیە دەکات‌و هەموو خوتەو بۆڵەبۆڵ‌و لێدانێکی باوکی بە بێدەنگی قەبووڵ دەکات وەکو ئەوەی بڵێ: من ئامادەم واز لە هەموو عەشرەتەکە بێنم، بەڵام دەستبەرداری بێریڤان نابم‌و بەتەنێ جێیناهێڵم... هەڵبەتە بەشێکی سەرکەوتنی فیلمەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەورە جوانەی ئەکتەرەکان بینیوویانە، تاریق ئەرکان،  دەوری شڤان دەبینێ‌و مەلکادە مراغ دەوری بێریڤان دەبینێ، ئەو بێریڤانە داماوەی بە درێژایی فیلمەکە تاقە قسەیەکی لە زار نایەتە دەر، هەر چییەك دەڵێ بە نیگا دەیڵێ...

جێی خۆیەتی لێرەدا هەندێك قسەی مەلکادە مراغ–ی ئەکتەر، دوای مەرگی یەڵماز گۆنای بە نموونە بێنینەوە: "لە هاوینی ساڵی 1978دا، لە ئەنتاکیاوە دەچووم بۆ ئەستەمول، دەبوایە بە ئەزمیردا تێپەڕم. ئیدی بڕیارمدا بۆ ماوەیەکی کورت لەوێندەر لابدەم‌و سەرێکی یەڵماز بدەم لە

زیندان... پێکەوە لە ژوورێکی بچووکی پێشوازیدا دانیشتین، زۆرمان باسی هونەری سینەماو گرنگی ئەو هونەرە کرد... یەڵماز بە دوورو درێژی باسی پرۆژەو بەرنامەکانی ئایندەی خۆی بۆ کردم، بە تایبەتی باسی بیرۆکەی فیلمی مێگەلی بۆ کردم. زۆرم پێ سەیر بوو کە داوای لێکردم دەوری سەرەکی لەو فیلمەدا بدینم, چونکە من پاش فیلمی (هاورێ) کە لەگەڵ یەڵمازدا تەمسیلم تیا کرد، هیچ دەورێکی دیکەم نەبینی و هەر وازم لە نواندن هێنابوو... کەچی سوور بوو لەسەر ئەوەی بەشداری لە فیلمەکەدا بکەمو، دەیگوت زۆر لە توانای هونەری من دڵنیایە، هەر چەندە من چ شارەزاییەکم لە ژیانی کوردو کوردەواریدا نەبوو... بەڕاستی من قەرزارباری ئەومو لە میانەی ئەم فیلمەوە ئاشنای ژیانی کوردەواری بەگشتی و بارودۆخی ئافرەتی کورد بە تایبەتی بووم. هەروەها شارەزای ژیانی گەلی خۆم گەلی تورك بووم. لە ڕێگەی ئەم فیلمەوە زۆر شتم زانی کە پێشتر نەمدەزانی... یەڵماز نەمردووە، بەڵکو لە ناوماندا دەژی..."

دەرهێنەر لە بەشی یەکەمی فیلمەکەدا ئەوەمان نیشاندەدات کە ئەو ژیانە لە جەوهەرو کرۆکدا هۆڤیانەیە، سامناکەو مەحاڵە بەو شێوەیە بەردەوام بێ.

بەشی دووەمی فیلمەکە کارەساتی خانەوادەکەی حەمۆ ئاغامان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن لە شاردا گیرۆدە دەبێ. خودانی خێزانەکە حەمۆ ئاغای پیرەمێرد ڕێکەوتننامەیەك مۆر دەکات، بەپێی ڕێکەوتننامەکە مێگەلە پەزەکەی دەفرۆشێت، بەلام دەبێ بە خۆی و لەسەر حیسابی خۆی مێگەلەکە بەرێ بۆ ئەنقەرە. مێگەلەکە لە قیتار بار دەکات و ئەنقەرە خۆت بگرە وا هاتم. هەرگیز ئەوەی بە بیردا نەهاتبوو کە گواستنەوەی مێگەلەکە ئەو هەموو گۆبەندەی لێدەکەوێتەوە.

ڕۆژی سەفەر نزیك دەبێتەوە، پێنج پیاوو ژنێکی نەخۆشی بێ هێزو هەناو مێگەلی گۆرین وەپێش دەدەن و دەکەونە ڕێ. حەمۆ ئاغای پیرو داماو لە کوڕەکەی دەپاڕێتەوە: "شڤان بە قسەم بکەو بێریڤان لەگەڵ خۆتدا مەبە، شوومە شووم... کوندە پەپووە، کوێرەوەریمان دێتە ڕێ،..."

بەلام شڤان قایل نەبوو, دەیگوت یان بیریڤان لەگەڵ خۆیدا دەبات و لە ئەنقەرە چارەسەری دەکات، یان ئەویش ناچێت... ئیدی بەو جۆرە سەفەری ئازارو داڕوخان دەستی پێکرد. کە مێگەلەکە دەگاتە یەکەم گوندی ڕێگا، حەمۆ دەکەوێتە داوەوە، دزەکان وا دەنوێنن کە بە شەڕ هاتوون، دەست بە تەقە دەکەن تا پەزەکان پەرت و بلاوببنەوەو بە ئاسانی بدزرێن، بەو جۆرە هەندێ لە مەڕەکان لە دەست دەدات، ئەوجا کە دەگاتە وێستگەی قیتار تووشی دەبێ بە تووشی دەزگای گەندەڵی دەوڵەتەوە، ئیدی هەر کەسەو بە جۆرێ داوای بەشە بەرتیلی خۆی دەکات، لە سەرۆکی وێستگەوە بیگرە تا دەگاتە شوفێری قیتار. دیارە هەر کەسەو بەپێی پلەو پایەی خۆی. هیچ چارێك نییە، ئەمە یاسا باوە –نەنووسراوەکانە– لەم دەوڵەتەدا.

جا لەوە خراتر، ئەوەیە کە پەزەکان لە ڕیزە فارگۆنێکی لەوتاو بە ماددەی (دی دی تی) ژەهراوی، کە پێشتر گواستوویەتیوە، بار دەکرێن و کۆمەڵێك مەڕی دی مردار دەبنەوە، ئەمە جگە لە دزینی کۆمەڵێك پەزی دی لە لایەن دزو چەتەو ڕێگرانی سەرانسەری ڕێگەکە... فیلمساز لە ڕێگەی ئەو سەفەرە ترسناکەوە پانۆرامایەکی تێروتەسەلی ژیانی هاوچەرخمان لە هەردوو کۆمەڵگەی تورکی و کوردیدا نیشاندەدات، لەلایەکەوە گەندەڵی دەزگاکانی دەوڵەت و دزی و دەستبڕی و، بەدڕەوشتی و

لەشفرۆشی، -کە سۆزانییە شەلەکە سلۆی کوڕە بچووکی حەمۆ ئاغا دەخەڵەتێنیّ و پارەکەی لێدەدزیّ- وێنەدەگریّ و لەلایەکی دیکەوە ئاماژە بۆ ژیانی سیاسی و ئۆپۆزیسیۆن و سەرکوتکردنی ئازادیخوازان دەکات -گرتنی ئەو مۆسیقارەی گۆرانی بۆ ئەنتەرناسیونالیزم و مرۆڤایەتی دەڵێت، هەروەها کوشتنی قوتابییەکی شۆڕشگێڕ کە بڵاوکراوەی سیاسی لە ناوەندی شاردا بڵاودەکاتەوە- بەڵام دەرهێنەر هیوا بڕاو نابیّ، بەڵکو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بەرگری هەیە، هێزێن پێشکەوتووخواز هەنەو دژی ڕژێمی وەخت، دژی گەندەڵی دەخەبتن، ئەویش لە ڕێگەی هاواری ئەو کوریژگە ڕۆژنامە فرۆشەوە، کە لە ناوجەرگەی ڕێبوارانی سەر شەقامەکەوە بانگ دەکات: "ڕۆژنامە.. وەرە بۆ ڕۆژنامە.. فاشیستان ڕیسوا دەکات... ئیمپریالیزم و تاوانەکانی لە وڵاتەکەماندا ڕیسوا دەکات..."

بەشی سێیەمی فیلمەکە داڕوخانی عەشرەتی ویسیکان و هەرەسهێنانی سیستەمی فیوداڵی داتەپیومان پیشان دەدات.

پاش سەفەرێکی نارەحەت، پاشماوەی مەڕە لاتەکان دەگاتە شار، بەو ئومێدەی بازرگانەکان بەڵێنی خۆبەجیّ بێنن، لیّ حەمۆ ئاغای پیرەمێرد جارێکی دی ڕووبەڕووی یاسا بازاڕییەکان و چاوچنۆکی بازرگانەکان دەبێتەوە... لە ئەنجامدا مل بۆ مەرجەکانی ئەوان دەدا، مێگەلەکەی بە هەرزانترین نرخ دەفرۆشێت و، دەیان پرسیار لە مێشکی دەوروکیّ... چۆن قەرزەکانی بداتەوە؟ چ بەو ڕەشە خێزانە برسییە بڵیّ کە لە گوند چاوەڕوانی دەکەن؟ عەشرەت چۆن ئەم زستانە تووشە بقەتێنیّ؟ بۆیە ڕازی نابیّ پارەیەکی زۆر بداتە شڤان کە بیریڤان بباتە سەر دکتۆر. هەڵبەتە حەمۆ ئاغا کە بەرپرسی یەکەمی کاروباری عەشرەتەکەیە، لەبەر ڕژدی و ڕەزیلی نییە کە پارەیەکی زۆر نادات بەشڤان، بەڵکو خەمی ئایندەی ماڵباتەکەی و نەپچڕانی شیرازەی عەشرەتەکەیەتی.

بە هەر حاڵ بە هەر جۆریّ بوو شڤان بێریڤان دەباتە لای دکتۆر، بەڵام بێریڤان بە هیچ جۆریّ قاییل نەبوو کە جلەکانی دابکەنیّ تا دکتۆر بیپشکنیّ... بەڵام حاڵی زۆر خراپ بوو، هیچ دکتۆریّ نەیدەتوانی فریای بکەویّ و ڕزگاری بکات.

بێریڤان، لێرە، لە ئەنقەرەدا تەواو هێزی لەبەر دەبڕیّ، ناتوانیّ بڕوات. شڤان ناچار دەبیّ لە کۆڵی بکات کە بەڕاستی دیمەنێکی یەجگار کاریگەرەو بە دەگمەن لە کارە سینەماییە هاوچەرخەکاندا دەبینریّ... شڤان دەیەویّ خۆی بگەیەنێتە ماڵی ناسیاوێکی، کە لە سەردەمی خزمەتی سوپاییدا یەکتریان ناسیوە، ماڵی ئەم ناسیاوەی لە قەراخی شاردایەو بە کرێیەکی کەمی مەڕی و مەمر پاسەوانی ئەپارتمانە گەورەکان دەکات. ماڵەکە، نیمچە کەلاوەیەکە، ئاوی نییە، کارەبای نییە، پەنجەرەی نییە، شڤان بە جۆریّ چاو بە ناو ژوورەکەو کەلوپەلە شڕو شەپڕێوەکانی ناویدا دەگێڕیّ، لە تۆوایە خۆزیای پێدەخوازیّ، چونکە ئەو ئەوەشی دەست ناکەویّ، نێگای دەکەوێتە سەر وێنەیەکی مارکس، کە بەبیّ موبالاتییەوە بە دیواری ژوورەکەوە هەڵواسراوە، ئەوجا سەری وڕوکاس و تەڕی خەم و پەژارەی دادەخات.

ئالێرەدا، لەم کەلاوەیەدا، بێریڤان بە بێدەنگی دەمریّ، وەکو چۆن بە خامۆشی ژیا، بیّ ئەوەی کەس هەست بە بوونی بکات.

هەڵبەتە بە زۆری وا باوە مردوو لە زێدو مەفتەنی خۆی بنێژرێ، شڤان پێویستی بە پارە دەبێ کە جەنازەی هاوسەرەکەی بەرێتەوە. ناچار روو لە بابی دەنێ. بابی قاییل نابێ، دەڵێت ئەو چاترکە مرد، بە زندوویەتی زۆرمان خێر لێ بینی، نۆرەی مردوویەتییە؟ شڤان زۆری لەبەر گران دەبێ، لەگەڵ بابیدا دەبێ بە دەمبۆڵەی و کابرایەکی بازاڕی دەکەوێتە نێوانیانەوەو بە تەوەسەوە دەڵێت: ئەوە چتان لێقەوماوە برادەرینە؟ لەسەر ئافرەتێکی مردوو شەڕتانە؟ ڕۆژی دەیان کەس دەمرێ با ئەمیش یەکێك بێ لەوانە، مردوو لە هەر شوێنێ بنێژرێ دەنێژرێ ئیدی ئەمەی بۆ چییە. شڤان زۆر تورە دەبێ پەلاماری کابرا دەدات و دەیەوێ هەرچی داخی دڵییەتی بەوی برێژێ.. لە پڕ کابرا دەکەوێ و سارد دەبێتەوە.

بەمجۆرە بێریڤان دەمرێ و شڤانیش بۆ زیندان. (سلۆ)ش بەرەڵای ناو شار دەبێ و نایەوێ بگەڕێتەوە. حەمۆ ئاغای داماویش بە دووی سلۆدا بانگە بانگ: سلۆ, هۆ سلۆ بەناو شار دەکەوێ بێ ئەوەی کەس گوێی بداتێ.. ئا بەو جۆرە دەرهێنەر، بە شێوازیکی واقیعی و بە گێڕانەوەیەکی روون و رەوان ئەنجامی حەتمی هەرەسهێنانی عەشرەتەکەی حەمۆ ئاغامان نیشاندەدات. هەڵبەتە ئەم فیلمە لە زۆر وڵاتی ئەورووپاییدا سەرکەوتنی باشی وەدەست هێناوەو پێنج خەڵاتی هونەریی باڵای لە فیستیڤاڵە نێو دەوڵەتییەکانی سینەمادا بردۆتەوە کە گەورەترینیان خەڵاتی میهرەجانی ((فالینسا)) بوو لە ئەسپانیا، ساڵی 1980.

## رێگا:

گۆنای، بە تایبەتی پاش فیلمی مێگەل: ئەستێرەی کەوتە بەرزی و ناوی کەوتە ریزی گەورە دەرهێنەرانی جیهانەوە. ئیدی گۆنای، بەرە بەرە لە مەسەلەی کوردی نزیك بووەوەو کەوتە ئەوەی سەربووری ئەم گەلە بهونەرێنێ و کارەساتەکانی بەرجەستە بکات و تاسەیان بۆ ئازادی بنوێنێ. هەڵبەتە ئەمەش هۆیەك بوو بۆ ئەو سەرکەوتنانەی کە فیلمەکانی دوایی بە دەستیان هێنا... ئەوەتا بە خۆی لە دیمانەیەکی رۆژنامەوانیدا بۆ رۆژنامەوانەکان دەدوێ: "ئەگەر کوردیش نەبوایەم، هەر بایەخم بە دۆزی گەلی کورد دەدا، تەماشاکە تا رۆژگاری ئەمرۆکەش 12 ملیۆن کورد، لە تورکیادا بێبەشن لە کەمترین ماف مرۆڤانی. تەنانەت ماف ئەوەیان نییە بە ئازادی بە زمانی زگماکی خۆیان بدوێن، ماقووڵە چاوپۆشی لەوە بکرێ؟!".

ئیدی لەو پێودانگەوە گۆنای لە زینداندا کەوتە نووسینی سیناریۆی فیلمی (رێگا). هەر لە زیندانەوە پرۆسەی دەرهێنانەکەی بەرێوەدەبرد، ئەوە بوو لە پڕ لە میهرەجانی (کان)ی سینەمایی نێو دەوڵەتی (35)دا، لە فەرەنسا پیشاندراو دەنگێکی گەورەی دایەوەو خەڵاتی یەکەمی میهرەجانەکەی (گەڵای ئاڵتوونی – السعفة الذهبیة)ی وەرگرت کە لە رووی بایەخی هونەرییەوە هاوتای خەڵاتی (ئۆسکار)ی ئەمریکییە. دەربارەی ئەم کارە هونەرییە، گۆنای دەڵێت: "... لە زینداندا سیناریۆی ئەم فیلمەم نووسی... لە زینداندا خەڵکانێکی زۆرم ناسین، دۆستایەتیم لەگەڵ زۆربەیاندا پەیدا کرد... ناو بەناو گوێم لە حیکایەت و بەسەرهاتی گرتنی ئەو دۆستانە دەگرت و بە ئەمانەتەوە لای خۆم تۆمارم دەکردن، ئیدی بەرە بەرە 12 چیرۆکم لەلا خڕ بووەوە... پێنج چیرۆکم

لەو 12یە هەڵبـژارد، ئەوانەی کە واقیعی بوون و لەگەڵ مەبەستی منـدا دەگونجـان... مەبەستەکە وێنەگرتنی ژیانی واقیعی ئێستای تورکیا بوو لە ڕێگای چارەنووسی ئەو پێنج زیندانییەوە کە بۆ جەژنی قوربان یەکی تەنیا یەك هەفتە مۆڵەت درا بوون..."

گۆنـای، پـاش بیرکردنەوەیـەکی زۆر، ڕووی لـە (شـەریف گـورین)ی دەرهێنـەر نـا، کـە فیلمەکـە دەربێنێ و جێبەجێی بکات. هەڵبەتە بۆیە شەریفی هەڵبژارد، چونکە کەسێك بوو بە باشی لە دنیای هونـەریی و سیاسـی گۆنـای حـاڵی دەبـوو، و پێشـتریش وەکـو یاریـدەدەر کۆمـەڵێك کـاری هونـەری لەگەڵ گۆنایدا کردبوو، لـەو کارانـە: فیلمـی ئومێد، پەند، نیگـەرانی و... هـەروەها چونکە شـەریف گورین بەرەگ و ڕەچەڵەك کورد بـوو، لـە خـەڵکانی دی زیـاتر شـارەزای داب و نـەریت و خـوو خـدەو تەبع و تەبیعەتی کوردەواری بوو.

بە هەر حاڵ فیلمەکە زۆر بە سەرکەوتووی جێبەجێ کرا، جێدەستی هەم گۆنای و هەم گۆرینی پێوە دیـار بـوو. ئەمـەش پرسـیارێکی لـە نێـو ناوەنـدە ڕەخنەوانییەکـەی سینەمادا ورژانـد کـە کـێ لـەو دووانە دەرهێنەری ڕاستەقینەی فیلمـی نێـو بـراوە؟ تـا شـەریف هاتـە وەڵام و مەسـەلەکەی یـەك لایـی کـردەوەو بـە ڕۆژنامـەوانانی ڕاگەیانـد کـە: "گۆنـای دەرهێنـەری ڕاسـتەقینەی فیلمەکەیـە و، هـەر ئەویش شایستەی ئەو ناوەیە، من و خەڵکانێکی دی جێبەجێکاری ئـەو دەسـتوورانە بـووین کـە ئـەو لە زیندانەوە پێی ڕادەگەیاندین."

ئـەدی گۆنـای چـۆن تـوانی لـە زیندانـەوە ئـەم شـاکارە بەڕێوەبـەری؟ ئەمـە پرسـیاری ڕەخنـەگران و ڕۆژنامـەوانان و ئـەهلی بوارەکـە بـوو... گۆنـای لـە وەڵامـدا دەڵێـت: "... لـەو سـەردەمەدا —واتـە لـە کۆتـایی سـاڵانی هەفتایـەکانی سـەدەی بیسـتەمدا— حیزبـی گـەلی کۆمـاری بـە ڕێبەرایـەتی بلێنـد ئەجەوید حوکمی وڵاتی دەکرد، حکومەت ڕێی بە خەڵکی دەدا بە بەردەوامی سـەردانی زیندانـەکان بکەن، ئێمەش ئەم دەلیڤەیەمان دەقۆستەوە، تیپی وێنەگرتن بـە تـەواوەتی سـەردانیان دەکـردم، جا لەو دیدارانەدا، دەیان پارچە کاغـەزم دەدانـێ کە بە وردی چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کارەکـەیان، بە چۆنیەتی وێنەگرتنیشەوە، تێدا تۆمار کرابوو، هەروەها داوام لە وێنەگران و ئەکتـەرەکان دەکـرد کە سەردانی هەندێ ناوچەی تایبەتی بکەن و شارەزای خەڵکەکە و داب و نـەریتیان بـن و بە فۆتـۆگراف وێنەی ناوچەکەو خەڵکی دەڤەرەکە بگرن، تـاوەکو هـەموو وردو درشـتێکی واقیعەکـەیان لەبـەر چـاو بێ..."

یەکێك لە هاوڕێکانی گۆنای لەم بارەیەوە دەڵێت: "... گۆنـای هـەموو گروپـی کارەکـەی بـۆ زینـدان بانگ دەکرد، تەنانەت کرێکاری ڕوناکیشی داوا دەکـرد، جـا لـە مـاوەی ئـەو دیدارانـەدا لەبـەر چـاوی ئەکتـەرەکان، چـۆنیەتی دەور بینینەکـەی ئـەوانی دەنوانـد... بـە وێنـەگرەکانی دەگـوت کـە چـۆن کامێراکانیـان بجـوڵێنن و چـۆنی بـەکار بێـنن و، چ عەدەسـەیەك بـەکار بێـنن، لـە تـۆ وایـە بـە درێـژایی تەمەنی خۆی وێنـەگری سـینەمایی بـووە. یـانی دەشـێت بڵـێین کـە ژووری دیـداری نـاو زیندانەکـەی دەکرد بە ستۆدیۆیەکی سینەمایی.. دوای دیدەنییەکان یەکسەر دەچووین بـۆ مەیـدانی وێنـەگرتن، چونکە زۆربەی گرتەو دیمەنەکانی فیلمەکە لە دەرەوە دەگیران... هەر کەسەو کـاری خـۆی دەزانـی و بە گوێرەی ڕێنماییەکانی گۆنای جێبەجێی دەکرد..."

هەڵبەتە هاوڕێیانی گۆنای، گەرچی ژمارەیان کەم بوو، دەوری یەجگار گەورەیان لەسەر خستنی ئەو کارانەیدا گێڕا کە لە زیندانەوە بەڕێوەی دەبردن و ئاراستەی دەکردن. هەڵبەتە بە خۆیشی زۆرجار بەمنەتباری و پێزانینەوە باسی ئەوەی کردووەو خۆی بە قەرزاربارییان زانیوە: "من قەرزارباری ئەو دۆستانەم کە" کاریان لەگەڵدا کردووم و بەدڵسۆزییەوەو بێ کەموکوڕی ڕێنماییەکانیان جێبەجێکردووم..."

هەڵبەتە هەر سەرکەوتنێك, هەر ناوو ناوبانگێك کۆمەڵێك ڕازو نهێنی خۆی هەیەو دەبێ بە خولیاو پرسیاری خەڵکانێك، گۆنای و سەرکەوتن و نێوبانگی گۆنای لای زۆر کەس بووە بە خولیاو پرسیار، پرسیار لە وەڵام گەڕاوە... ئەوەتا دمیتریس زانیاکیس-ی ڕەخنەگری سینەمایی بەناوبانگی یونانی دەربارەی گۆنای دەڵێت: "... یەکێك لە ڕازە هەرە گرنگەکانی سەرکەوتنی گۆنای ئەوەیە لە ناو گەلدا دەژی نەك لە تەنیشتی، هەرچییەکی وێنەگرتووە، بەڵگەو گەواهی زیندووە لەمەڕ هەژاری و دواکەوتووی و چەوساوندنەوەی گەلی کورد... سەرچاوەی هێزی فیلمەکانی وێنەگرتنی ژیانی واقیعییە بە هەموو حەقیقەتە تاڵەکانییەوە، ئەوەی گۆنای وێنەی دەگرت و نیشانیدەدا بەلای تەماشاڤانی ڕۆژئاواییەوە خەوی سامناکە، لێ مەخابن ئەوە واقیع بوو نەك خەیاڵ... تایبەتمەندییەکی دیکەی کارەکانی گۆنای، کە بێ چەندو چون بەڵگەی بلیمەتییەکی خالیسەیە، ئەو گونجانە هەرە سەرکەوتووەیە کە لە نێوان لایەنی دیکۆمێنتی و لایەنی چیرۆکەوانی فیلمەکانیدا هەیە..."

جێی خۆیەتی لێرەدا بەخێرایی ئاماژە بۆ پێکهاتەی فیلمی (ڕێگا) بکرێ کە بە شاکارێکی گۆنای دەژمێردرێ.

## (( پێکهاتەی فیلمی ڕێگا ))

قارەمانانی (ڕێگا) پێنج زندانی بەناو (ئازاد)ن، بۆ جەژنی قوربان حەوت ڕۆژ مۆڵەتیان دەدرێتێ کە سەردانی کەس و کاریان بکەن. کامیرای گۆنای بەگەڵیان دەکەوێ بۆ ناو ماڵ و کەس و کاریان. قارەمانەکان بریتین لە: (یوسف، مەولود، سەید عەلی، محەمەد ساڵح و عومەر) ئەمانە لە زیندانێکی ئەستەموولدا حەپسن (زیندانی ئیمرالی، کە گۆنای بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێندەر حەپس بوو) ئەمانە بەرەو ماڵی خۆ وەرێدەکەون بەو ئومێدەی ماڵ و منداڵ و کەسوکاری خۆ بدینن، ئەم بەناو (ئازاد)انە لە ڕێگەدا لووتیان دەتەقێ بە واقیعی ئیرهابی باوی وڵاتەوە (ڕووداوی فیلمەکە پاش کودەتا سوپاییەکەی ئەیلولی ساڵی 1980)یە. هەر چەند کیلۆمەترێك و وێستگەیەکی پشکنین و ناسنامە داوا کردنە، یوسف، لە خۆشیداو بەدەم سوعبەت و گاڵتەو گەپی ناو ئەو پاسەی کە سواری بوون، مۆڵەتنامەکەی ون دەکات، پاش تۆزێك پاسەکە دەوەستێ و پۆلیسێك بۆ پشکنین سەردەکەوێ. یوسف لە مۆڵەتنامەکەی دەگەڕێ و نایدۆزێتەوە. ئەمە بۆ خۆی دەبێ بە کارەساتێك ئەوسەری دیار نەبێ، سوێند بۆ کابرای پۆلیس دەخوات کە ئێستا ونی کردووە، ئەویش وەکو هاوڕێکانی لە مۆڵەتی هەفتانەدایە... پۆلیسی تورکیا ئەمە نازانێ، پاڕانەوەی یوسف دادی نادات، ڕێ و ڕێ دەیگەڕێننەوە بۆ حەپسخانە... مەولود بەرەو شاری قۆنیا وەرێدەکەوێت تا دەزگیرانەکەی بدینێ،

بەڵام داب و نەریت ڕێی نادات بە تەنیا دەزگیرانەکەی بدینێ و... ئیدی مەولود ناچار دەبێ ڕوو بکاتە سۆزانیخانەکان و مەیلە سێکسییەکانی دابمرکێنێتەوەو بەو جۆرە بارە دەروونی و سایکۆلۆژییەکەی وای لێدەکات زۆربەی کاتەکانی لە مەیخانان و مەلهاکاندا بەسەر بەرێ...

واقیعیەتی گۆنای هەر لەوەدا دەرناکەوێ کە ناکۆکییەکانی نێو سیستەمی باو دەردەخات و بەرجەستە دەکات، بەڵکو لەوەشدایە کە ناکۆکی و دژەکانی ناو ناخی قارەمانەکانیشی لێهاتووانە بەرجەستە دەکات.. ئەوەتا مەولود لە دیمەنێکدا لە وەڵامی داوایەکی دەزگیرانەکەیدا کە لەسەر ئەدرەسی پوری نامەیەکی بۆ بنێرێت دەڵێت: "گوێ مەدەیێ، ئەوە واقیعی ئێمەیە... ئەوانە (واتە کەسوکارەکەت) خەڵکانێکی پاشڤەڕۆن، هێشتا لە سەدەکانی ناڤینداده‌ژین..." ئەوجا ئاوڕ لە دەزگیرانەکەی دەداتەوەو جارێکی دی پێی دەڵێتەوە: "گوێ بگرە، کە بووی بە هاوسەرم، لێت قەبووڵ ناکەم بە بێ ئیزن لە ماڵ بچیتە دەرەوە... نابێ لەگەڵ بێگانانەدا پێ بکەنی، تەنانەت نابێ بڕوانیتە چاویان... قسەی من لە ماڵدا یاسایە... وا ڕاهاتووم، دەبێ هەمووان گوێڕایەڵی من بن... حاڵی بوویت..."

سێ قارەمانەکەی دی کەتەوە ری سەرەکی بابەتی فیلمەکەن، لووتیان دەتەقێ بە واقیعی سەخت و دژواری گەلی کوردەوەو باقی ڕووداوەکانی تری فیلمەکە لە کوردستاندا ڕوو دەدات. ئەو پاسەی هەر سێ زیندانییەکەی هەڵگرتووە (حەمە ساڵح و سەید عەلی و عومەر) دەچێتە ناوچەی کوردستانەوە (وشەی کوردستان، بۆ یەکەمجار لە مێژووی سینەمادا، لەسەر شاشە دەردەکەوێ) بەو شێوازە یەڵماز کوردستان لە تورکیا جیا دەکاتەوە، جا یەڵماز گۆنای لەو بارەیەوەو پاش ئەوەی لە زیندان دەڕەڤێ، دەڵێت: ".... من قەناعەتی تەواوم هەیە کە لە ناو تورکیادا کۆلۆنییەك هەیە کە پێی دەگوترێ کوردستان... هەوڵم داوە، لە ڕێگەی قارەمانە سەرەکییەکانمەوە, چاوێك، ئەگەر سەرپێیانەش بێ، بە ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابووری ناو ئەو کۆلۆنییەدا بگێڕم..."

ئیدی ئەو سێ قارەمانە لێکدی جیا دەبنەوەو هەر یەکەیان بەرەو شوێنی خۆی دەڕوات و هەر یەکەیان تووشی دەبێ بە تووشی کۆمەڵێك ئاریشەو گرفتەوە کە لە پاش ئەوان ڕوویان داوە. بەڵام یەڵماز هەموو ڕووداوەکان بە شێوەیەکی هونەرییانە لێك دەدات و لە کۆتاییدا تەماشاڤان ڕووبەڕووی ئەو کارەساتانە دەکات کە بەرۆکی کوردی گرتووە، ڕووبەڕووی ئەو چارەنووسەی دەکات کە لە سایەی داگیرکەری تورکدا چاوەنۆڕی گەلی کوردە.

سەید عەلی، بەرەو ماڵ پێ هەڵدەگرێ، تامەزرۆی دیداری هاوسەرەکەی و کوڕەکەیەتی، بەڵام کە دەگاتە ماڵەوە سەیر دەکات ژن و کوڕەکەی لەوێ نین. ژنێکی تازە لە ماڵەکەیاندایە، تومەز بابی بە گوێرەی دابی فرە ژنی لە کوردستاندا، ژنی دووەمی هێناوە، دەچێت بەلای دایکیدا کە لە ناو جێگەدا کەوتووەو بە خەمینی لە ژن و کوڕەکەی دەپرسێت. دایکی وەڵامی دەداتەوە: "خیانەتی لێکردی کوڕەکەم... ها لە حەپسدایە لە ماڵی کەسوکاری... ویستی شوو بە کەسێکی دی بکات..."

بەڵێ لە ماڵی بابی، لە گوندێکی دوورە دەستی چیاییدا، زیندانەو چاوەنۆڕی مەرگی خۆیەتی، کە بە پێی داب و نەریت دەبێ بەدەستی مێردەکەی ئەنجام بدرێ، چونکە بە مولکی مێردەکەی

حەساوە. ژن برا گەورەکەی پێی دەڵێت: "…. گوێ بگرە سەید، ئێمە سوورین لەسەر کوشتنی، بەڵام مادام خۆت هاتیتەوە، بەخۆت ئەو کارە بکە… شەرەفی تۆ شەرەفی ئێمەشە، ئێمە ئامادەین یارمەتیت بدەین ئەگەر پێویست بکات…"

سەید عەلی، لێدەبڕێ تۆڵەی خۆی بسەنێ، بەناو بەفرو زریاندا وەڕێ دەکەوێ بۆ ماڵ خەزوری… ئەسپەکەی لە ناو چڕە بەفردا، بەرگەی سەرما ناگرێ، پەکی دەکەوێ و دەکەوێ، سەید عەلی بۆ ئەوەی لەو عەزابەی ڕزگار بکات فیشەکێکی پێوە دەنێ و دەیکوژێ… دیمەنێکی زۆر سامناکە، خوێنی گەرم ئاوێتەی بەفری سپی دەبێ و، لە تۆ وایە لە خودی بەفرەکەوە هەڵدەقوڵێ. یەڵماز تیشك دەخاتە سەر وڵاتی شاخاوی کوردان و ژیانی سەرەتایی کوردەواری و دابڕانیان لە جیهان، بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا. سەید دەگاتە ماڵی خەزوری، خەزوری (بابی ژنەکەی) بەدەم وێردو قورئان خوێندنەوە پێشوازی دەکات، باوەڕی وایە ئەو کارە وەسوەسەی لە دڵ دەرەوێنێتەوە: "کوڕی خۆم گەر دەتەوێ ژنەکەت بدینی ئەوەتا لەو زنجەدایە، وەکو کسۆکان دەژی… ئەوە هەشت مانگە تەنیا نانی وشك و ئاو دەخوات…. پیاو بەو سۆزو بەزەیی وەڵاوە بنێ… گلاوە…"

سەید عەلی چاوەڕوان ناکات بەیان بدات، لە نیوە شەودا قرێر دەدات ژنەکەی و کوڕەکەی هەڵگرێ و بچێ بۆ ماڵی ژنبرا گەورەکەی، تا لەوێندەر, بە بەرچاوی هەمووانەوە فەوت و فەنای بکات، ژنەکەی لەبەر لاوازی و بێهێزی بەرگەی ڕێگەوبان و سەرمای کوشندە ناگرێ، پاش ململانێیەکی زۆر لەگەڵ خۆی و سروشتدا لە هەمان ئەو شوێنەدا کە پێشتر ئەسپەکەی تیا کەوت دەکەوێ و دەمرێت، ئەمەش دەلالەتی خۆی هەیە. جا سەید عەلی وێڕای رقی زۆری لە ژنەکەی، هەست بە جۆرە گوناح و بەزەیییەك دەرهەق بەو زەعیفەیە دەکات. دەیکاتە کۆڵ، داوا لە کوڕەکەی دەکات لە پشتەوە بەر قایشەکەی پشتی بدات، بەڵکو خوێن لە دەمارەکانیا بجمێ… بەڵام هەوڵەکانی، هاوارو پاڕانەوەی: "زێنێ… زێنێ… رابە، هۆشت بێتەوەبەر"، مەنوو زێنێ… (وەکو ئاماژەیەك کە دەیبەخشێت) بە فیڕۆ دەچێت و دادی هیچ نادات…

بەڕاستی دیمەنی دڵتەزێن بەرجەستەکراوەو ڕووندك لە چاڤان دەفرێنێ…. ئەوەتا خاتوو سەما بوراس–ی دەرهێنەر دەربارەی فیلمی ڕێگا لە وتارێکیدا بە ناونیشانی (پاشای ناحەز هیوامان بۆ دێنێ) دەڵێت: "…. لەگەڵ دەستە خوشکێکدا لە بەرلین خۆم بە هۆڵی سینەمایەکدا کرد تا فیلمی ڕێگا بدینین کە دەمێك بوو چاوەڕێی بووین… هۆڵەکە تەژی خەڵکی بوو، خەڵکی جیاواز لە رووی نەژادی نەتەوەییەوە، هەراو ژاوەژاوێکی زۆر لە هۆڵەکەدا هەبوو، بە تایبەتی لە دەوروبەری ئێمە، چەند جارێك داوای بێدەنگیم لێکردن… لە پڕو بە شێوەیەکی نا ئاسایی بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو هۆڵە گەورەیەدا کێشا… پاش ماوەیەك گوێم لە دەنگی گریانی ئەو خەڵکەی دەوروبەرم بوو، بە تایبەتی دەستە خوشکەکەم، بەڵام من بە حوکمی ئەوەی دەرهێنەرم خۆم گرت… کەچی بێ ئەوەی بە دەستی خۆم بێ فرمێسك لە چاوانم هەڵوەری…. فیلمەکە تەواو بوو، خەڵکەکە بە کڕی لە هۆڵەکە دەرکەوتن و سەری ڕێزیان بۆ فیلمسازەکە دادەنەواند…."

هەڵبەتە گۆنای زۆر هونەرمەندانە واقیعی دواکەوتووی کوردەواری، لە سایەی داگیرکەری تورکدا نیشانداوە، ئەوەی دەرخستووە کە پەیوەندییە فیودالی و خێڵایەتییە باوەکان هەموو لایەنەکانی

ژیانی کوردەواری گرتۆتەوەو ئیفلیجی کردووە، بە تایبەتی ئافرەت کە هەم لە رووی نەتەوەییەوەو هەم لە رووی کۆمەڵایەتییەوە دەچەوسێنرێتەوە.. ئەمە لە کاتێکدایە، کە هەر کۆمەڵگەیەك ئازادی ئافرەتی تێدا نەبێ، مەحاڵە کۆمەڵگەیەکی ئازاد بێ.

قارەمانی دووەم مەمەدە (بچوککراوەی ناوی محەمەد)ە بەرەو دیاربەکر دەچێت، ژنەکەی و منداڵەکانی لەوێن لە ماڵی خەزوری... بەدەم رێوە خەم و پەژارەکانی کاوێژ دەکاتەوە چ شتێك چاوەڕوانی دەکات؟ کاردانەوەی کەسوکاری ژنەکەی بەرانبەر بەم چ دەبێ؟ بە تایبەتی کە پێیان وایە ئەو بووەتە هۆی مردنی (عەزین)ی ژن برای، کاتێ کە لەگەڵ پۆلیسدا بەشەڕ هاتووە و ئەم بە تەنێ بەجێی هێشتووە... بەڵام تاسەو ئارەزووی دیداری ژن و منداڵەکانی هەموو شتێکی لەبیر دەباتەوە.. بەڵام کە دەگاتە جێ و دەیەوێ ژن و منداڵەکانی بەرێ، کەس قاییل نابێ و دەریدەکەن. خەسووی پێی دەڵێت: "گومبە لەبەر چاومان خوێڕی بێشەرەف. منداڵەکانی لە باوەشی دەردێنێ و بە زمانێکی کوردی پەتی بانگیان دەکات (ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە زمانی تورکی نازانێ)... وەرن رۆڵەکانم.... بابتان خوێڕییە، ترسنۆکە، کوڕە لاوەکەمی لەبەر دەستیاندا جێهێشت و هەڵات تا خۆی رزگار بکات..."

بەڕاستی زۆر جار داب و نەریت جێی یاسا دەگرێتەوەو گەلێك سەختگیرترو دژوارتریشە، ئەمە چ حوکمێکە دوای ماوەیەکی زۆری دووری نەتوانی ماڵ و منداڵی خۆت لە ئامێز بگری و بیانلاوێنی... بە هەر حاڵ مەمەد فرسەت دێنێ و دەمەو ئێواری ماڵ و منداڵەکەی هەڵدەگری و خۆشیان نازانن بۆ کوێ. ژن و مێرد لە نێو قیتارداو لە ئاودەستدا، ئارەزووە سێکسییەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن، بەڵام لێیان دەکرێ بە قوزەڵقورت و ژەهری مار، رێبوارەکان پێیان دەحەسن، هات و هاوارو جنێو بەرز دەبێتەوە، تێرو پڕ تێهەڵدان دەخۆن... پۆلیس قیتارەکە ئاگادار دەبێتەوەو دێت، ئەویش بەسەریاندا دەبۆڵێنێ: "بێ ئەخلاقینە... شەرمە بۆ ئێوە... خۆتان دەبیننەوە... چۆن زات دەکەن..." مەمەد بە دەمە لالکیوە پێی دەڵێت: "قوربان ئەمە ژنمەو ئەوانەش منالمن..." پۆلیسەکە پێیدا هەڵدەشاخێتەوە: "بە چیدا بزانم ژنتە... کوا بەڵگەتان..." مەمەدی داماو بێدەنگ دەبێت بەڵگەنامە لە کوێ بێنێ، ئەوان بە شێوەی لادێ مارە براون، شێخ یان مەلایەك دێ و بە شایەتی دوو کەس لێکدییان مارە دەبڕێ.

پۆلیسەکە دڕ بە خەڵکەکە دەداو جارێکی دی دەڵێت: ".... بەڕاستی شەرمە, دوای تۆزێکی دی دەگەینە وێستگەو لەوێندەر دەتاندەمە دەست پۆلیسی تاوان..." لەم کاتەدا برا بچووکی ژنەکە لە ناو قیتارەکەدا بۆیان دەگەڕێ تا بیانکوژێ، کە ئەو دیمەنە دەبینێ، لە ترساندا هەڵدێ.

گۆنای لەو دیمەنانەدا جگە لە ریسواکردنی داب و نەریتە کۆن و سواوو پواوەکان، بوونی حکومەتی عورفیش لە کوردستاندا ریسوا دەکات، کە خۆی لەو هەموو سەربازخانەو جم و جۆڵە بەردەوامە سامناکانەی فرۆکانی جەنگیدا دەبینێتەوە، هەروەها پاشکەوتووی شاری دیاربەکریش دەخاتە ئەستۆی داگیرکەری تورك...

قارەمانی سێیەم (عومەر)ـە کە بە ئیعترافی گۆنای خۆی هەڵگری هەمان بیروبۆچوونی گۆنایە سەبارەت بە دۆزی رزگاریخوازی گەلی کورد.

عومەر بەرەو گوندە بچووکەکەی خۆیان وەڕێدەکەوێ، گوندەکەیان کەوتۆتە سەر سنووری نێوان تورکیاو سوریاوە. ئیدی کە گوندی لێ بەدیار دەکەوێ بزەی شادی دیداری کەسوکارو ئازیزان دەکەوێتە سەر لێوانی. کە چاوی بەو خانووە قوڕانە دەکەوێ، لەو وایە مەزنترین کۆشك و تەلاری مێژوون.. بەڵام ئەو خەیاڵە خۆشانە زوو هەڵوەرین، هەر کە لە گوند نزیك بووەوە گوێی بە دەنگی تەقە زرینگایەوە. دوای تۆزێ هەمدیس بێدەنگی و خامۆشییەکی ترسناك باڵی بەسەر گوندا کێشایەوە، لە تۆ وایە دەمێ ساڵە چۆڵە. کەچی دەنگی سەربازێك بێدەنگییەکەی شڵەقاند: "ئەگەر تەسلیم نەبن، ماڵەکانتان بەسەردا دەڕوخێنم... تا سێ دەژمێرم.. یەك.. دوو..." ئەوجا دەنگێك وەك ئەوەی لە بنی بیرەوە بێ گوتی: "تەقە مەکەن.... تەقە مەکەن... تەسلیم دەبین...." هەر هەموو ئەمە لەبەرچاوی ئەو کلۆڵەدا کە تازە گەیی بووەوە روویدا.. خەم و پەژارەیەکی کوشندە لە رووی نیشت، بوو بە شایەتی دەستگیرکردنی کۆمەڵێکی دی لە خەباتکارانی کورد.. بەنیگای خەمگین و مێشکی جەنجاڵەوە بەرێی کردن. لە دڵی خۆیدا بۆ چارەیەك دەگەڕا.

هەر کە دنیا تاریك بوو, شەڕ دەستی پێکرد, گیز و هۆڕی گوللە نیشانەی بەرگری خەباتکاران بوو... بابی عومەر دەڵێت: ((ئاوا دەژین کوڕم. ژیانێکی دژوارە... کورد بوون بەسە بۆ ئەوەی بخرێیتە کەمینی مەرگەوە.)) عومەر دەزانێ کە (ئەبوزەید)ی براگەورەی لە چیایە, بۆیە خەم لە چارەی کەسوکاری نیشتوەو شەڕ بەردەوامە لە نێوان دایك و باوکیاندا لەسەر چارەنووسی کوڕەکەیان...

لەگەڵ گەردی بەیانیدا, دەنگی ژنان بە زمانی کوردی بەرز دەبێتەوە: "... دەی رابن... رابن... ئەوا جەندرمە جەنازەی شەهیدەکانیان بۆ هێناوینەوە... ئەوە ئەنجامی شەڕەکانی دوێ شەوە."

ئوتومبیلێکی جێبی عەسکەری، بە کۆمەڵێك جەنازەوە بۆ ناو گوند دێ، خەڵکی گوند لە مەیدانی گوندا بۆ پێشوازی جەنازەکان خڕ دەبنەوە. ئەفسەرێك دەچێتە سەر تاوێرێك و دەڵێت: "هاووڵاتیان.... ئەمە نیشتمانی هەموومانە... ئێمە رۆڵەی یەك وڵاتین و هیچ جیاوازییەکمان لە نێواندا نییە... لە ئەنجامی شەڕەکانی دوێنێدا (5) کەس کوژراون... ئەمانە ناسنامەیان پێ نییە، هەر کەسێکتان دەیانناسێتەوە دەبێ قسە بکات.... ئەگەر دەربکەوێ دەیانناسن و بە درۆ خۆتان لە گێلی دەدەن، ئێوەش وەکو ئەوان لێدەکەین... حاڵی بوون؟ عەسکەر پیاوانی گوندیان ریز کرد، تا هەر یەکەیان سەیرێکی جەنازەکان بکات... چ داواییەکە.... کێ دەوێرێ بڵێ من ئەمەیان دەناسم؟ ئەمە چ کارەساتێکە باب، یان برا حاشا لە ناسینەوەی کوڕ یان برا کوژراوەکەی بکات!! عومەر جەنازەی برا گەورەکەی دەناسێتەوە... بەڵام قسە ناکات... ناچارە دەبێ بێدەنگ بێ... دەنا ئەویش دەکوژن. تەگبیر؟ لێدانی دڵی زیاد دەکات، خوێن لە دەماریدا هەڵدەچێ: کە ئەفسەرەکە لێی دەپرسێت ئایا کەسیان دەناسێت؟ عومەر سەری بادەدا کە نەخێر. نیگاشی یەکپارچە تورەیی و تۆڵەیە... بەو جۆرە ریزی خەڵکەکە بە بەردەم جەنازەی شەهیدەکاندا رەت دەبێ و دڵیان تەژی حەسرەت و خەمە بۆ شەهیدەکانیان... هەموو حاشا لە جەنازەکان دەکەن... ئەم زوڵمە تاکەی؟ عومەر وێڕای تکاو پاڕانەوەی داك و بابی کە بگەڕێتەوە بۆ زیندان و حوکمەکەی تەواو بکات، یاخی

دەبێت و پێیان دەڵێت: "نەخێر جارێکی دی ناگەڕێمەوە بۆ زیندانەکانیان.... دەچمە چیا... تاکەی ئەم زوڵمە قەبووڵ بکەین...."

گۆنای، بوێرانە هەڵوێستە نەتەوەیی و شۆڕشگێرییەکانی خۆی لە فیلمی ڕێگادا بەرجەستە کردووەو لە ماوەی پەنجا دەقیقەیەکدا زۆر شتی نیشان داوین و فیلمەکەی لە هەموو ڕوویەکەوە سەرکەوتووەو ڕەخنەگران بە (ئەلیازەی تورکی)یان وەسف کردووە، دەڵێن لە هەوەڵییەوە تا کۆتایی مایەی سەرنجەو بە تەکنیکێکی هونەری بەرز ئەنجام دراوە. بە پارچە مۆسیقایەکی خۆش و ژان ئامێز شوبهێنراوە، ئامرازێکی فێرکردنە، وانەیەکی خەباتگێڕییەو لە خزمەتی کەرامەتی مرۆڤانی و ئازادیدایە.

بەڵام گۆنای, وە کو هەر هونەرمەندێکی ڕەسەن لە بارەی فیلمی ڕێگاوە دەڵێت: "من نالێم، لە فیلمی ڕێگادا گوزارشتم لە هەموو لایەنێکی وڵاتەکەم کردووە، باسی ئەڤین و سۆزم کردووە، باسی قوربانی دان و دڵسۆزیم کردووە، باسی تەمای ژیانی سەربەرزانەم کردووە، باسی مل کەچ نەکردن و یاخی بوون، باسی ترس و نیگەرانیشم کردووە.... بەڵام زۆر شتی دیکەش ماون کە نەم پەرژاوە باسیان بکەم.."

بەڵێ گۆنای نەیپەرژا زۆر شتان بڵێ و هەموو کول و کۆڤانی میللەتی خۆی دەربڕێ، چونکە کودەتا سوپاییە شومەکەی 1980/9/12 بە سەرکردایەتی کەنعان ئەفرین ژیانی لە ملیۆنەها خەڵکی وەکو گۆنای حەرام کرد... ژیانی گۆنای، کە لە زینداندا بوو، کەوتە مەترسییەوە. قەراری نەقڵی بۆ زیندانی (ئەسبارتا) دەرچوو، ئەسبارتا کەوتۆتە دورگەیەکی دوورە دەستی ناو دەریای مەرمەرەوە. لەوێ ناچار کرا واز لە کاری سینەما بێنێ... و هەڕەشەی کوشتنی لێدەکرا، بۆیە گۆنای ناچار بوو لە زیندان هەڵێ و ڕوو بکاتە هەندەران و لە غوربەتدا بە نەبەدڵی بژی..

## دەربەدەری و غەریبایەتی

گۆنای، لە 9/ت1981/2، بە یارمەتی هەندێ دۆستی دڵسۆز لە زیندانی ئەسبارتا و لە تورکیا هەڵات و ڕووی کردە وڵاتی یۆنان کە زۆر بە گەرمی باوەشی بۆ گرتەوە و وەزیری ڕۆشنبیری ئەو کاتەی وڵات کە ئەکتەری ناودار (میلینا میرکوری) بوو وەکو هونەرمەندێکی گەورەو شۆڕشگێڕ پێشوازی لێکرد.

ڕاستە گۆنای لە چنگی ڕاستەوخۆی جەلادانی ڕژێمی تورکیا دەرباز بوو، بەڵام لە ئەورووپاشدا هەر نیگەران بوو، هەڕەشە لەسەر ژیان و مانی هەبوو، بەربەرەکانی کارە ئەدەبی و سینەماییەکانی دەکرا، جەنەراڵەکانی تورکیا هەوڵی زۆریان دا کە فیلمەکانی لە وڵاتانی ئەندامی ناتۆدا نیشان نەدرێن و هەڕەشەی لێدەکردن کە ئەگەر ڕێ بە نیشاندانی فیلمەکانی گۆنای، لە وڵاتەکانیاندا بدەن، ئەوا پەیوەندی دبلۆماسیان لەگەڵدا دەبڕێ. بەڵام ئەو دەوڵەتانە گوێیان بەو هەڕەشانە نەداو دەرگای هۆڵی سینەماکانیان بە هەفتەو دوو هەفتەو زیاتر بۆ نیشاندانی فیلمەکانی گۆنای خستە سەر پشت.

ژیـانی گۆنـای یـەجگار دژوار بـوو، تـاپۆی تـرس و مـەرگ وەکـو سـێبەر بەدوایـەوە بـوو، هـەڵاتن و خۆشاردنەوە بوو بوو بە بەشێکی سەرەکی ژیانی، نەك لەبەر ترسنۆکی، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ئەوە تاقە شێواز بوو بۆ بەگژاچوونەوەی رژێمی تورکیاو بەردەوام بوون لەسەر ریسواکردن و لەقاودانی.

ئـەو قۆنـاغـە، واتـە قۆنـاغی سـەفەری ناچـاری بـەناو وڵاتـە ئەوروپییـەکان و یۆنـان و سویـسـراو فەرەنسادا, قۆناغێکی هەرە گرنگی ژیـانی گۆنـای بـوو لەسـەر هـەردووك ئاسـتی سیاسـی و هونـەری ئەو ئازادییـەی لـە ئـەوروپادا هـەبوو، رێگـەی بـۆ خۆشـکرد لـە نزیکـەوە ئاشـنای خـەباتی سیاسـی و پرۆپاگەندەیی بزاڤی کوردی ببیٚ، ئامانج و ئاواتەکانی بناسێت و، تێکەڵی خەڵکانی کـورد ببیٚ و لـە هاماجێکی جیاواز لە هاماجی وڵاتـانی داگیرکـەری کوردسـتاندا هـەڵس و کـەوتیان لەگەڵدا بکات.

ئیدی ئەو فاکتەرانە کردیانە کارێك کە هەستێکی نەتەوەیی زیاتری لەلا بخوڵقیٚ و زۆرتـر هەسـت بـە کول و کۆڤانی گەلەکەی بکات و راستەوخۆ بەشداری لـە خـەباتی ئاشـتیانەی ئـەو گەلـەدا بکـات و بـە راشکاوی بڵیٚ کە من لە پێناوی کوردستانی یەکگرتووی سەربەخۆو دیموکراتیـدا دەخـەبتم... ئـەوە بوو لەگـەڵ کۆمـەڵێك رۆشـنبیری کوردا بەشـداری لـە دامەزرانـدنی (ئەنسـتیتۆی کـورد لـە پـاریس)دا کـرد، مەبەسـتی ئەنسـتیتۆی نێـوبراو بوژانـدنـەوەو پەرەپێـدانی کـەلتووری کـورد بـوو کـە لـە لایـەن رژێمانی داگیرکەری کوردستانەوە هەرەشـەی نـەمان و نەهێشـتنی لێدەکرا. ئەنسـتیتۆی نێـوبراو لـە 1983/2/24دا کرایەوە.

هەر چەند گۆنـای نـەخۆش بـوو، بـەڵام بـەدەم ئازارەوە درێـژەی بە کـاروانی هونـەری خـۆی دەداو لـە مانگی 10/1982- 4/1983دا لە وێنـەگرتنی فیلمـی (دیـوار) بـووەوە، لـەم فیلمـەدا هەوڵیداوە بـە شێوازی هونەرییانە تاوانەکانی دیکتاتۆریەت لە تورکیادا ریسوا بکات، بە تایبەتی کـە ئـەمجارەیان دوور بـوو لـە دەسـتی سانسـۆری تورکیـا، فیلمەکـە لـە بـاکوری فەرەنسـاو بـە کۆمـەك و پشـتیوانی حکومەتی فەرەنسی وێنەگیراوەو کلێسایەکی فەرەنسی, چونکە لە رووی سیستەمی بیناسازییەوە گونجـاو بـووە، کـراوە بـە زینـدانێکی تـورکی و رووداوەکـانی فیلمەکـە دەربـارەی ژیـانی زینـدانیانی تورکیایە، بە تایبەتی زیندانیانی منداڵ. وێڕای مامەڵەی ناشیرین و بارودۆخی سەخت و دژوار، ئـەم منالانـە ((بونیاتنـەرانی ئاینـدە)) بـە پێچـەوانەی هـەموو یاسـاو دابێکـی مرۆڤـانی و پـەیمانێکی نێـو دەوڵـەتی دەخرێتـە بـەر ئـازارو ئەشـکەنجەدان. هەڵبەتـە گۆنـای بـۆ سـازدانی ئـەم فیلمـە پشـتی بـە ئـەزموون و سـەرنجەکانی خـۆی لـە نـاو ئـەو زیندانانـەدا بەسـتووە, گۆنـای لـەم فیلمـەدا ئـەو ئەشکەنجەدانە نیشان دەدا کە منالێکی لە ژووری بەرێوەبەری زیندانەکەی خراوەتـە بـەرو لـە ژێـر وێنەیەکی رەمزی گەورەی کەماڵ ئەتاتورکدا، ئەم منداڵـە لـە ژێـر ئەشکەنجەدا دەمرێت... هەڵبەتـە دیمەنەکانی ئەم فیلمە زۆر لە رەخنەگرانی سینەمای ترساندووەو بەکارێکی موبالەغە ئامێزیان لـە قەڵەم داوە.

دیارە گۆنای ئەمەی لەبەر گران بووە، بۆیە لەو بارەیەوە بە کـورتی گوتوویـەتی: "... زۆر زەحمەتـە بـۆ ئەوروپییـەکان بـاوەڕ بـەوە بکـەن کـە لـە تورکیـادا روو دەدات، بـەڵام ئـەوەی مـن نیشـانم داوە وێنەیـەکی زینـدووی واقیعـی حـەقیقی تورکیایـە، مـن دڵنیـام رۆژێـك دێـت ئەوروپییـەکان دان بـەو راستییەدا دەنەن..."

چالاکی و کارەکانی گۆنای لە هەندەران، جەنەڕاڵەکانی تورکیای تەواو هەراسان کردبوو، بۆیە بیریان لەوە کردەوە کە تۆڵەی لیٚ بکەنەوە، بەلای کەمەوە کاریگەری کارەکانی لەسەر کۆمەڵگای تورکی کەم بکەنەوە. ئەوە بوو دادگا عورفییەکان حوکمیٚکیان دەرکرد کە دەست بەسەر هەموو کارە هونەریی و ئەدەبییەکانی گۆنایدا بگیریٚ و بسووتیٚنریٚ، تەنانەت ئەو فیلمانەش کە تەنیا تەمسیلی تیٚدا کردوون، لە 1983/10/19دا سەرکردایەتی بەشی ئاسایشی سیاسی حوکمی نیٚو براوی پەسند کرد.

ریٚك وەکو چۆن فاشییەکانی ئەڵمان لەسەردەمی دەسەڵاتی خۆیاندا ئەمەیان دەرهەق بە رۆشنبیریی پیٚشکەوتووخواز کردبوو، بە هەر حاڵ هەر هەموو ئەو شتانەی لە دوورو لە نزیك پەیوەندییان بە گۆنایەوە هەبوو سوتیٚنران...

دیارە ئەم رەفتارە ناشیرینە بووە مایەی نارەزایی ناوەندە ئەدەبی و هونەریی و، تەنانەت سیاسییەکانیش، لیٚرەدا چەند نموونەیەك لە وتەی ئەو خەڵکانە دەخەینە ڕوو:

عەلی ئوزکونتریك: "..... باوەڕ بەم کارە هۆڤییە، ناشیرینە نامرۆڤانییە ناکریٚ... زمان ناتوانیٚ ئەم تاوانە وەسف بکات..."

تاریق ئەکان (لە هەردوو فیلمی میٚگەل و ریٚگادا تەمسیلی کردووە: ".... کاریٚکی سەیرە... لە وڵاتی ئیٚمەدا کتیٚب و فیلمان دەسووتیٚنریٚن... بەڕاستی ئەم وەزعە تەحەموول ناکریٚ... لە سایەی ئەم بارودۆخەدا مەحاڵە دیموکراسییەت لە وڵاتماندا بیٚتە دی...."

بیداد غونیول: ".... خودایە، ئەم هونەرمەندەی شۆڕەتی جیهانی پەیدا کردووە، لای ئیٚمە، لە تورکیا دەیانەویٚ بیفەوتیٚنن...."

فیکری ساخلار (ئەمینداری گشتی حیزبی گەلی سوسیالیست دیموکراتی تورکی): ".... ئەم کارە جەزرەبەیەکی توندە لە هونەر... ئەم کارە پیٚوەرو پیٚوانەیە بۆ زانینی بیرو ئامانجیٚن رژیٚم لەلای ئیٚمە..."

پاش ئەوە تورکیا ناوی گۆنای لە سەرانسەری تورکیادا قەدەغە کرد، ناسنامەی تورکی لیٚ سەندەوە، لە ماڤ هاووڵاتیبوون مەحرومی کرد. لە پاشملە حوکمیدا، حوکمی پتر لە سەد ساڵ زیندانیکردنیدا، بە جددی کەوتە هەڕەشە لە بەرژەوەندی ئەو وڵاتە هاوپەیمانانەی کە ریٚگەی گۆنایان دەدا بچیٚتە وڵاتەکانیان.

دیارە هەر هەموو ئەو کارە دزیٚوانە تینویٚتی جەنەڕاڵە دڵڕەشەکانی رژیٚمی تورکیای نەشکان، بۆیە پەنایان بردە بەر شیٚوازی راوەدوونان و رەشەکوژی.. چەند هەوڵیٚکیان لەو بارەیەوەدا، کە ترسناکترینیان ئەوەی تونس بوو، گۆنای ماوەیەك لە تونس مایەوە، بەڵام بە زیرەکی و وریایی، خۆی لەو داوە لاداو هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە قەدەر داویٚکی گەورەتری بۆ ناوەتەوەو لە ئاوارەیی و غوربەتدا، دوور لە دارو بەردو تەپرو خاکی نیشتمان، لە ترۆپکی بەخششی هونەریدا، لە 47 ساڵیدا گوڵی تەمەنی هەڵدەوەریٚنیٚ.

ئەوە بوو بەیانی 1984/9/9 ڕۆژنامەو بلاَڤۆكانی فەرەنسی و ئەورووپی، لەلاپەڕەی یەكەمیاندا، وێنەی گۆنایان لە چارچێوەی ڕەشدا بلاَوكردەوەو هەواڵی مەرگیان لە نەخۆشخانەیەكی پاریسدا، بە نەخۆشی شێرپەنجەی گەدە بلاَوكردەوە...

دیارە هەواڵی مەرگی گۆنای لە سەرانسەری دنیادا دەنگی دایەوەو سوێی خستە دڵی ملیۆنان كەسەوەو ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی جیهانی بایەخێكی یەجگار زۆریان پێداو فیلمەكانی لە تەلەفزیۆن و سینەماخانەكانی ئەورووپادا، هەر لە فیلمی (ئومێد)ەوە بیگرە تا دەگاتە فیلمی (دیوار) بە درێژایی هەفتەو دوو هەفتەو پتر لێدرانەوەو ملیۆنان كەس دیتیانن... شاعیری ناوداری یۆنانی تیودوراكیس بەمجۆرە دەیلاوێنێ: "…. بە هەواڵی مەرگی ئەم كەسە مەزنە زۆر خەمبار بووم…. بێگومان مەرگی ئەو خەسارەتێكی گەورەیە بۆ كۆمەڵگەی پێشكەوتووخوازو هونەر لەم سەردەمەی ئێمەدا... بە هونەر ژیانی گەلە تێكۆشەرەكەی لە پێناوی ئازادیو پێشكەوتن و ماف مرۆڤدا بەرجەستە كردووە…. ئا لەم ساتە كارەساتاوییەدا، لەم ساتی تەنگانەیەدا لەگەڵ هەموو گەلی یۆنانیدا پشتیوانی لە خەباتی گەلانی توركیا دەكەم دژ بە ڕژێمی فاشی….".

ئەگەرچی ڕژێمی فاشیستی توركی دەیویست هەواڵی مەرگی ئەو كەڵە پیاوە بخاتە بەر سێبەر، بەلاَم زۆر ڕۆژنامەی توركی هەواڵەكەیان بلاَوكردەوەو بە كورتی هەندێ شتیان دەربارەی هەندێ لە كارەكانی بلاَوكردەوە... بۆ وێنە گەورە ڕۆماننووسی كوردی، توركی نووس وای وەسف دەكات كە لە هەموو ئەوانەی لە ژیانیا دیتوونی بەهرەدار ترو داهێنەر تر بووەو كارە ئەدەبییەكانی زۆر بەرز بوون و، دەڵێت: "…. یەڵماز هەر دەرهێنەرێكی چاك نەبوو، بەڵكو ئەدیبێكی گەورەش بوو…".

هەر ئەهلی ئەدەب و هونەر بە تەنیا یەڵمازیان نەلاواند، بەڵكو پیاوانی دەوڵەت و سیاسەتیش لاواندوویانەو ستایشی هونەرەكەیو خەباتی شۆڕشگێڕانەیان كردووە. ئەوەتا مەكسیم غریمیتس–ی ئەندامی مەكتەبی سیاسی حزبی شیوعی فەرەنسی، لە كاتی ناشتنی جەنازەكەیدا دەڵێت: "گۆنای ژیانی بۆ خزمەتی ئازادی گەلەكەی تەرخانكرد، لە هەمان كاتدا هونەرەكەی هونەرێكی شۆڕشگێڕانەیەو لە خزمەتی مرۆڤایەتیدایە..." لە ئاماژەیەكدا بۆ دیدارەكانی لەگەڵ گۆنایدا دەڵێت: "خاوەنی دڵێكی گەورە بوو، دڵنیا بوو لە سەركەوتنی دۆزی ڕەوای گەلەكەی..."

بەو جۆرەو لەسەر وەسێتی خۆی جەنازەكەی برا بۆ ئەنستیتۆی كورد لە پاریس، تا لەوێندەرەوە بەڕێ بكرێ بۆ گۆڕستانی (بیرلاشێز)ی (گۆڕستانی شۆڕشگێڕانی فەرەنسی).

جاك لانك–ی وەزیری ڕۆشنبیری فەرەنسی, لەبری حكومەتی فەرەنسا، لە ڕێورەسمی بە ڕێكردنی جەنازەكەدا بەشداری كردو لە ریزی پێشەوەی بەشداراندابوو، و بەمجۆرە دەیلاوێنێ: "گۆنای لە ریزی پێشەوەی سینەماكارانی جیهانیدا بوو، تێكۆشەرێكی بوێرو داكۆكیكارێكی دەگمەن بوو لە زۆرلێكراوان و چەوساوان... كارە هونەرییەكانی بۆ هەتا هەتایە بە نەمری لە بیرو بیرەوەرییەكانماندا دەمێنن…."

دیارە ڕێو ڕەسمی بە ڕێكردنی جەنازەكە چەند سەعاتێكی خایاند، هەزاران كەس بەشدارییان تێدا كرد، كە هزرڤان و كەڵە هونەرمەندانی جیهانی و نوێنەری ڕێكخراوە فەرەنسی و جیهانییەكان و گەورە سیاسەتوانانی فەرەنسیان تێدا بوو، لەوانە: (مەكسیم غریمیتس، جوی هیریز–ی ئەندامانی

مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمۆنیستی فەرەنسی، لیونیل جوسپانی سکرتێری یەکەمی حیزبی سوسیالیستی فەرەنسی، نوێنەری خاتوو دانیال میتران، سەفیری یونانی لە فەرەنسا لەبری سەرۆکی حکومەتی یۆنان ئەندریاس باپاندریو)و (باتریك جیراو، و کوستاف گافراس و خەڵکانی دی لە کەڵە هونەرمەندان)و جەماوەرێکی زۆر لە رۆڵەکانی جالیەی کورد لە ئەوروپا، کە وەکو وەفاداری و رێز بۆ ئەو هونەرمەندەی کە زۆری خزمەت کردبوون، بۆ پاریس هاتبوون.
لە سەعات دوو و نیوی پاش نیوەڕۆی رۆژی 1984/9/13دا جەنازەکەی لەناو خەرمانی گوڵدا خرایە سەر ئوتومبیلێکی فەرەنسی حکومەتییەوەو بۆ مەیدانی کۆماری لە ناوەندی پاریس، گوێزرایەوەو لەوێوە هەزاران فەرەنسی و بێگانە بەگەڵ کاروانەکە کەوتن بەرەو گۆڕستانی ناوداران وەڕێکەوتن.
ئەم رێو رەسمی بەڕێکردنە بوو بە خۆپیشاندانێکی گەورە دژی دەسەڵاتی سەرکوتکاری تورکی و، بوو بە هاوسۆزییەکی جیهانی لەگەڵ خەباتی گەلی کوردستاندا، ئیدی دەنگی سرودی نێو نەتەوەیی بە هەموو زمانە جیاوازەکان وەکو رێزلێنان لە گیانی پاکی ئەم تێکۆشەرە بەرز بووەوە، ئەم تێکۆشەرەی ژیانی خۆی لە پێناوی سەرەتا مرۆڤانییەکاندا داناو بەڕاستی بوو بە یەکێك لە قارەمانانی شۆڕشی جیهانی، لە پێناوی ئازادی و نەهێشتنی زوڵم و زۆر، پاشان، دوای ناشتنی جەنازەکەی، وێنەکەی لە کەلێنێکی کۆشکی ناوداراندا لە پاریس لە پاڵ وێنەی قارەمانانی نەمری شۆڕشی فەرەنسیدا هەڵواسرا...
گۆنای بە هەموو هێزییەوە هاواری دەکرد: "ژیانم موڵکی گەلەکەمە، موڵکی گەلە چەوساوەکەمە، موڵکی گەلە تێکۆشەرەکەمە، موڵکی گەلە ئازادیخوازەکەمە، ئامانجی من لە ژیاندا هونەر نییە، بەڵکو رزگاری گەلەکەمە.
هەر بۆیەش ئەو هەموو رێزو قەدرەی هەبوو، نموونەی پیاوەتی و شەهامەت بوو، گۆنای وەکو چۆن رۆشنبیریی مرۆڤایەتی بە کارەکانی دەوڵەمەند کرد، بە هەمان شێوەش بە هونەرو ئەدەب و بەها روحی و ئەستاتیکییە بەرزەکانی رۆشنبیریی کوردی دەوڵەمەند کردووە. بۆیە گرنگیدان بە کەلەپووری گۆنای، بلاوکردنەوەو پاراستنی لە فەوتان و شێوان، ئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوەییە...
گۆنای لە ماوەی تەمەنی کورتی خۆیدا (47 ساڵ) کە 14 ساڵی لە زینداندا بەسەر برد، توانی 5 رۆمان و پتر لە 100 چیرۆك و سیناریۆی فیلم و 23 فیلمی بە ناوەرۆك سیاسی – کۆمەڵایەتی رەخنەیی و، بە شێوەی هونەری بەرز بەرهەم بهێنێ و لە پتر لە 120 فیلمدا دەور بگێڕێ... یەکێك لە رەخنەگرەکان لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئەوەی گۆنای بەو تەمەنە کورتەوە بەرهەمی هێناوە، یەکێکی دی بوایە بەسەد ساڵ بەرهەمی نەدەهێنا".

## یەڵماز گۆنای-مان لە دەستدا

هونەرمەندو فیلمسازی دیارو شۆڕشگێری رەشیدو خەباتگێڕی بوێر، ئەو کەسەی لە دڵی ملیۆنان زەحمەتکێشدا دەژی، یەڵماز گۆنای هونەرمەندی مەزن لە 9/سپتامبەری 1984دا لە پاریس، لەو

شوێنەدا کە وەکو پەنابەری سیاسی لێی دەژیا، بە نەخۆشی شێرپەنجەی گەدە مرد، پاش ڕێزلێنانی شۆڕشگێڕانەی هەزاران زەحمەتکێش لە گۆڕستانی (پیرلاشز)، گۆڕستانی قارەمانانی کۆمۆنەی پاریس بە خاك سپێردرا. دوا داوای یەڵماز ئەمە بوو: سەرمامە، بە پەتۆی سەربازەکانی کۆمۆنە داپۆشن. لە ڕاستیدا مەرگی یەڵماز گۆنای کە تا دوا هەناسە دلێرانە لە پاڵ پرۆلیتاریای جیهانیدا ڕاوەستا. مەرگێکی ئاسایی نییە، مەرگێکی پڕ غروورو سەنگینە. هەم پرۆلیتاریاو خەڵکی تورکیاو، هەم پرۆلیتاریای جیهان و خەڵکانی چەوساوەی سەرانسەری دنیا بەڵێنیان داوە کە بە دڵ و بە گیان پارێزگاری لە کەلەپووری شۆڕشگێڕانەی یەڵماز بکەن، بزاڤی شۆڕشگێڕی ئەنتەر ناسیونالیستی و بزاڤی کۆمۆنیستیی تورکیا، کە بەشێکی لە جیابوونەوە نەهاتووی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی ئەنتەرناسیونالیستییە، دەبێ بزانن کە چۆن دەرس و پەندی پێویست لەم مەرگە پڕ شانازییە وەربگرن. لە کاتی مەرگی ئەوا، ئۆرگانی جیاوازی چاپەمەنییەکانی بۆرژوازی، گوتارو مانشێتی وەك "پاشای بێتەخت و تاج"یان دەربارەی یەڵماز گۆنای بە چاپ گەیان. لە ڕاستیدا ئەمە خۆی لە خۆیدا کۆمەڵە نیشانەیەکی حەقیقەتی تێدایە. یەڵماز گۆنای، شۆرەتێکی چاکی لەسەر ئاستی تورکیاو جیهان هەیە، ملیۆنان کەس خۆشیانگەرەکە، هەر ئەمەش یەکێکە لە هۆیە گرنگەکانی پەلاماری دڕندانەی ئاشکراو نهێنی چینە دەسەڵاتدارەکانی تورکیاو نۆکەرەکانیان بۆ سەر یەڵماز گۆنای، چونکە نەیانتوانیبوو بە پارەو سامان ژیانی ئاسوودەو پلەو پایە بیکڕن، ئەوجا پەنایان بردە بەر بوختان بۆ کردنی بە ئومێدی ئەوەی هەندێ لەو زیانانە کەمبکەنەوە کە بە زەبری هونەرو خەباتی یەڵماز لێیان کەوتبوو.

یەڵماز گۆنای، زیاد لە هەموو شتێك هونەرمەندێکی گەورەبوو، هەروەها وەکو چیرۆکنووس و ڕۆماننووسی چاکیش جێ پێی خۆی کردبووەوە. یەڵماز گۆنای، پیاوێکە بە قووڵی لە حەقیقەتەکانی خەباتی چینایەتی لە تورکیا و لە جیهاندا تێگەییبوو. کەسێك بوو وەکو جەنگاوەرێکی بێباك لە پێناوی شۆڕشدا، هاو هەڵوێستی جەماوەری خەڵك و شۆڕش بوو، دژ بە ئیمپریالیزم و سوسیال ئیمپریالیزم و هەموو کۆنەپەرستان.

کەسێك بوو تا دوا هەناسە هونەرەکەی وەکو چەکێکی کاریگەر بۆ خزمەتی جەماوەری خەڵك تەرخانکرد.

یەڵماز گۆنای، بە ئاشکرا لە پێناوی پێشڤەبرنی خەباتی زۆرلێکراوانی تورکیا تێدەکۆشاو هاوبەشی خەباتی سەربەخۆیی و دیموکراسی خەڵکی بوو.

ئاشکرایە کە یەڵماز گۆنای ڕێبازێکی پرۆلیتاریایی شۆڕشگێڕی لە ئایدیۆلۆژیاو هونەرەکەیدا نەبووە. ئەوەی هونەرەکەی و ڕێبازی بنەڕەتی خەباتەکەی دیاریدەکات، ڕێبازی دیموکراتیزمی شۆڕشگێڕی بۆرژوایە. یەڵماز ئیمپریالیست دژێکی سەرسەخت، نیشتمانپەروەر، دیموکرات و شۆڕشگێڕێکی شێلگیر بوو. واتە کۆمۆنیستێکی شێلیگیر نەبوو. گەرچی ڕاستگۆیانەو دڵسۆزانە پشتی بە هەندێ بنەمای مارکسیزم– لینینزم بەستبوو، بەڵام نەگەییە حەقیقەتە گشتییەکانی و نەوەکو پراتیکی دیاریکراوی شۆڕشی تورکیا پەرەی پێدەدا. لە ئەنجامدا نەیتوانی سنووری ڕێبازی وردە بۆرژوایی دیموکراتیزمی شۆڕشگێر ببەزێنێ و لەگەڵ ڕەوتی ڕێبازی کۆمۆنیستی و

بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا تێکەڵ ببێ و . لە راستیدا کۆششەکانی بۆ بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی هونەری –سیاسی وەك "گۆنە، MAVIS, EKIM" و هەوڵدانی بۆ دامەزراندنی گرووپێکی سەربەخۆ لە هەوادارانی خۆی، رەنگدانەوەی هەمان رێباز بوون.

بەڵام ویڕای هەموو ئەمانە، لایەنێکی گرنگی دیکەی یەڵماز گۆنای وەکو هونەرمەندێکی مەزن و مامۆستایەکی فیلمساز ئەمە بوو کە لە بواری پراتیکی کۆمەڵایەتیدا تا رادەیەکی زۆر لە ژێر کارتێکردنی کۆمۆنیزمدا بوو و، بە گەشەکردنێکی زیادەوە لە سیاسەت و ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم نزیکتر دەبووەوە. ئەگەرچی لە بارەی سیاسی و ئایدیۆلۆژیکییەوەو رێکخراوەییەوە پەیوەندی بە حزبی کۆمۆنیستی "مارکسیست– لینینیست"ی تورکیاوە کە بەشێکی لە جیابوونەوە نەهاتووی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی ئەنتەر ناسیونالیستییە، نەکرد، ئەم کارتێکردنی هەڵوێستی کۆمۆنیزمییە لە یەڵماز، لەو حەقیقەتەوە دەردەکەوێ کە داکۆکی لەوە دەکرد کە کەلەپووری حیزب مارکسیستی– لینینیستییە. لەوەوە دەردەکەوێت کە داکۆکی لە سووربوونی شۆڕشگێڕی دەکرد. تێدەکۆشا داکۆکی لە کەلەپووری ماو دژ بە هێرشە جیاکانی رڤیژنیستییەکان، بە تایبەتی هێرشەکانی حیزبی کاری ئەلبانیا بکات. لە راستیدا ئەمە یەکێکە لەو بەڵگانەی کە هەوڵ و رووداوە ئەنتی شۆڕشگێڕییەکانی پشت پەردەی "سوسیالیزم" و "کۆمۆنیزم" لە پاڵ هەوڵە جیاجیاکانی ئۆپۆرتونیستی وردە بۆرژوایی نەیانتوانی تۆمەتی سیاسی و ئایدیۆلۆژی بۆ یەڵماز گۆنای هەڵبەستن، واتە تەنانەت لەو دەمەشدا کە بە تەواوی هەوڵیاندەدا گۆنای بۆ لای خۆیان راکێشن.

ئەدی بۆچی یەڵماز گۆنای هەڵوێستی دژ بە ئیمپریالیستی، هەڵوێستی نیشتمانپەروەری، شۆڕشگێڕی و دیموکراتی خۆی تا دوا هەناسە پاراست، کەسێك کە دژی هەموو قازانجێکی شەخسی و پلەو پایەیەك بوو، کەسێك کە هەرگیز خیانەتی لە خەڵك و شۆڕش نەکرد، کەسێك هەرگیز سەر بۆ ئەو هێرشە هەمە جۆرانەی دەکرانە سەری شۆڕ نەکردو تەسلیم نەبوو، نەیدەتوانی تەکانێکی چۆنی بەرەو تێکەڵ بوون لەگەڵ بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا بە خۆی بدات؟! بێگومان گەلەك هۆی مەوزوعی و زاتی هەن. بە هەر حاڵ یەکێك لە بەڵگە هەرە گرنگەکان ئەمەیە کە بزووتنەوەی کۆمۆنیستی تورکیا، لەبەر ئەو هەڵەو لاوازییانەی لە ریزەکانیا هەبوون، ئەو ئەرکە مێژووییەی کە دەبوا بیگرێتە ئەستۆ ئەنجامی نەدا، ئەمە فاکتەرێکی گرنگ بوو بۆ تێکەڵ نەبوونی یەڵماز گۆنای لەگەڵ بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا. بێگومان ئەم لایەنە سەلبیە، واتا پەیوەندی نەکردنی بە بزاڤی پرۆلیتێرییەوە، بە هەر حاڵ سێبەر ناخاتە سەر خەبات و هونەری شۆڕشگێڕی یەڵماز گۆنای کە بەشێکی لە جیابوونەوە نەهاتووی هونەرو خەباتی تورکیایە، بۆیە پاراستنی کەلەپوری میراتی شۆڕشگێڕانەی هەر کەسێك کە لایەنگری خەڵك و شۆڕش بێ ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە بە تایبەتی شۆڕشگێڕانی کۆمۆنیست دەبێ ئەو لایەنەی کارو ژیانی یەڵماز کە بە تەواوی لە خزمەتی کۆمۆنیزمدا بوو، بپارێزن و رازی نەبن هیچ جۆرە دەستکارییەك بکرێ یان بشێوێنرێ.

بەڵێ یەڵماز گۆنای مردووە. بەلام لە راستیداو ئێستا لە نێو دڵی کاروانی خەباتی خەڵکی تورکیاو میللەتە جیاوازەکاندایە، خەباتی ئەو لە پێناوی دیموکراسی جەماوەریو سەربەخۆییدا، نەمرو زیندووە.

مەرگی یەڵماز، لەلایەنە هۆنتای فاشیستی تورکیاوە کە زۆر درندانە بەربەرەکانی گۆنایان دەکردو چەندین ساڵ زیندانییان کرد، بە شادییەکی زۆرەوە پێشوازی کرا. ئەلهەقی گۆنای-ش دەورێکی گەلەك گرنگی لە ریسواکردنو پەردە لە روو هەڵماڵینیان هەبوو.

لەلایەکی ترەوە ملیونان خەڵکی رەنجبەر کە بە دڵو بە گیان خۆشیان دەویست بۆی خەمبارو عەزابار بوون.

لە راستیدا، لە کاتێکدا چینە دەسەڵاتدارەکانی تورکیا و قسەکەرەکانیان تەنانەت پاش مەرگی گۆنای-ش بوختان بە هونەرو خەباتی ئەو پیاوەدا دەکەن، گروپە نیشتمانپەروەرەکان، رێکخراوە دیموکراتو شۆڕشگێڕەکانو بزووتنەوەی کۆمۆنیستی تورکیا لە پێش هەموویانەوە بەشێوەیەکی فراوان لە تورکیاو لە شارەکانی ئەوروپادا یادی گۆنایان کردۆتەوەو هەوڵیانداوە میراتی شۆڕشگێڕانەی ئەو بکەن بە چەکێکی کاریگەر دژ بە دیکتاتۆریەتی فاشیستی.

پێویست بە گوتن ناکات کە نە هێرشی کۆنەپەرستانەو نە بوختان هەڵبەستن بۆ کەلەپووری شۆڕشگێڕانەی یەڵمازو نە هەوڵدان بۆ لاواز نواندنی ئەم کەلەپوورە نابن بە بەرهەڵست لەبەردەم خەڵکی تورکیادا بە هەموو میللەتە جیاوازەکانییەوەو بە تایبەتی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی تورکیا کە بەوپەڕی تواناوە کەلەپووری ئەو بپارێزن.

## یەڵماز رەمزی تەمەرود بوو...

**جهانی برای فتح "بردنەوەی جیهان"** ئێمە هەواڵەکانی مەرگی هونەرمەندی شۆڕشگێڕ، یەڵماز گۆنایمان، کە خەسارەتێکی گەورەیە بۆ خەڵکی جیهان، موتابەعە کردووە، دەمانەوێ رای تۆ وەکو دۆستێکی دێرینەو هاوکارێکی هونەریو سیاسی ئەو بزانین، یەڵماز گۆنای چ رۆڵێکی دیتوە وەك هەبوو، چۆن گەییە پلەی ئەو فیلمسازو هونەرمەندەی کە ژیانو کاری خۆی بۆ شۆڕش تەرخانکرد؟

**نیهایت بهرام:**

یەڵماز گۆنای، کەسایەتییەکی گرینگ بوو بۆ خەڵکی تورکیا. زۆر کەس وێنەی ئەویان بە دیواری ژوورەکانیانەوە هەڵدەواسی چونکە یەڵماز بۆ ئەوان رەمزو نیشانەی گەردن کەشیو سەربەرزی بووە، ئێمە ئێستاکێ کە مردووە پتر هەست بە بایەخی ئەو دەکەینو زیاتر هەست بەو کەلێنە دەکەین کە جێی هێشتووە. پێم وایە دەبێ چەند خاڵێکی سەرەکی رەچاو بکرێن: ئەو پیاوە هونەرمەندی جەماوەر بوو. زاتی خستە بەر ئەوانەی کە دەیانویست هونەری شۆڕشگێڕی دابهێنن —هەلومەرجێك لە کایەدابوو کە ئەم کارە لە گوین نەبوو لە نێو هێزە پێشکەوتووخوازەکاندا جۆرێك "هونەر بۆ هونەر" باو بوو – ئەو "یەڵماز" ئیلهامی بەوان بەخشی. یەڵماز، کەڵکی لەو دەرفەتانە وەرگرت کە هەبوون، بەلام لە پێناوی هونەری شۆڕشگێڕیدا. ئەگەر بیویستایە دەیتوانی ببێ بە هونەرمەندێکی بۆرژوا. بەلام کاتێ کەسایەتییەك یان هونەرمەندێکی ناسراو بیت، دەبێت

هەڵوێستی خۆت ئاشکرا بکەیت. لە تورکیادا هەر کە بڵێی کۆمۆنیستی، ئیدی بە یاخی دەناسرێی و –بەخوتو خۆڕایی حەوت ساڵ زیندانت بە تەنگەدا دەدرێ. زۆربەی کات هونەرمەندان دەکەونە بەر ئەم یاسایە. یەڵماز گۆنای دەیگوت: "تا ئەم یاسایانە هەبن دەبێ زات وەبەر خۆت بنەیت و دژی ئەم یاسایانە کار بکەیت". جارێکیان لە گوتارێکدا نووسی: "من بابایەکی کۆمۆنیستم. مارکسیست– لینینست" حەوت دانە ساڵیان حوکمدا. بەڵام ئەو پێی وابوو ئەمە جەزرەبەیەکە لە یاساکەی ئەوان. ئەو، بەپێی یاسا "بانگەشەی کۆمۆنیستی" چەندین جار هەر کاتێ قسەی کردبێ زللەی خواردووە، دە ملیۆن کورد لە تورکیادا هەن. لێ بەپێی یاسا بە رەسمیەت نەناسراون، واتە دانیان پێدا نەنراوە. نابێ بە زمانی خۆیان بنووسن یان قسان بکەن. گۆرانی کوردی قەدەغەیە. هەر زمانێکی تری دنیا لە تورکیادا ئاساییەو سانسۆری لەسەر نییە تەنیا کوردی نەبێت. یەڵماز بە شانازییەوە دەیگوت کوردە. کورد بوون تا رادەیەك لە کۆمۆنیست بوون خراپترە. چونکە لەم حاڵەتەدا بەجوداخواز لە قەڵەم دەدرێ.

گەلێك لە هونەرمەندە کوردەکان ئەم حەقیقەتە پەنهان دەکەن. بەڵام یەڵماز, هەستی بە بایەخ و گرنگی خستنە روو, و ئاشکرا کردنی ئەم مەسەلەیە کردبوو.

یەڵماز, پاش ئازاد بوونی لە زیندان وەکو کرێکارێك لە رێگەی گواستنەوەی ئەڵقەی فیلمەوە لە سینەمایەکەوە بۆ سینەمایەکی دی داخڵی پیشەی فیلم سازی بوو. لەم رێگەیەوە زۆرکەسی دیتن و ئاشنایان بوو. و بوو بە بەشێك لەوان, نەك وەکو بورژوایەك بەڵکو وەکو یەکێك لە جەماوەری خەڵکی. ئەمە تواناو بەهرەی وێنەگرتنی ئاشکرای خەڵکی ناوچە جیاوازەکانی تورکیای وەك چۆن خۆیان هەن, لەلا زیادکرد. چونکە بە باشی دەیناسین. لەو زەمانەدا شەخسیاتی ((ناسك و جوانی)) وەکو ئەوروپییەکان لەسەر شانۆکانی تورکیادا باویان بوو. گۆنای لە چەند فیلمێکدا رۆڵی بچوکی بینی, بەڵام بە شێوەی خودی خەڵکی وجەماوەر بوو. گۆنای, روخسارێکی ئاسایی هەبوو بۆیە هەر زوو شۆرەتی پەیداکرد. لە ماوەی پێنج ساڵێك, لە ساڵانی 60دا نزیکەی سەد فیلمی عەسابەی دروست و گەلاڵە کرد کە بەخۆیشی رۆڵی سەرەکی تێدا بینی, ئیدی بەمە یەکجار زۆر ناسرا.

لە قۆناغی دووەمی کاری سینەماییدا هەم رۆڵی سەرەکی بینی و هەم زۆر سیناریۆی لەسەر مەسەلە کۆمەڵاتییەکان نووسی. ئەمە پێشکەوتنێکی گەورە بوو بۆ ئەو و بووە مایەی شۆرەتی ئەم فیلمانە. ئەوەی دەشێت ناوی قۆناغی سێیەمی لێبنرێ ئەو ماوەیە بوو کە سێ فیلمی تێدا دەرکرد. فیلمی ((بووکی زەوی )) بریتیە لە چیرۆکێکی خەمناك 1968. ((گورگەبرسییەکان)) 1969 و ((ئومێد)) کە تێکرا گرنگی سەرەتای پەیدا بوونی ریالیزمی کۆمەڵایەتی بوون لە تورکیا.

پێم وایە ((ئومێد)) گرنگترین فیلمی مێژووی سینەمای تورکیا و چاکترین کاری یەڵماز گۆنای بێ. شێوەی هەڵسەنگاندنی مەسەلەکانی خێزان, زەوی, خەباتی خەڵکی و پەیوەندی نێوان رەش و رووتترین توێژی کۆمەڵایەتی و هەر لەم زەمینەیەدا ئاشکراکردنی جیاوازی نێوان ئایدیالیزم و ریالیزم, لەسەر بناغەی ریالیزم داڕێژراوە. ئەمە چیرۆکێکی واقیعی ژیانە نەك شتێکی دەستکرد و خەیاڵزادە. پاڵەوانی سەرەکی فیلمەکە عەودالی دوای گەنجە تا بتوانێ گیروگرفتەکانی خۆی پێ

چارەسەر بکات. بەڵام کاتێ کە نایگاتی شیرازەی خێزانداری و هەموو شتەکان لێك دەپچڕێن, دوچاری نائومێدی دەبێت و شێت دەبێت. ئەمە یەکەمین فلیمە کە گۆنای پاڵەوانی بە تەمسیل تێهەڵدانی تێدا دەخوات – لەبری ئەوەی هەمیشە بەرەندەو پاڵەوانێکی بەهێزبێ– لەبەر ئەمە دەتوانن لایەنە بنەرە تیەکانی ریالیزمی کۆمەڵایەتی لەم فلیمەدا بدینن. یەلماز, لەم فلیمەدا تەواوی تواناو بەهرەی خۆی بەکاردەهێنا. وەختێ ((الیاکازان)) بۆ یەکەم جار ئەو فیلمەی بینی گوتی: ((ئێمە بەرانبەر فیلمسازێکی زۆر گەورە وەستاوین)). فلیمەکە هەر زوو بە هەنجەتی دژایەتی کردنی ئاین و هاندەرو بزوێنەری هەژاران دژ بە رژێم قەدەغە کرا. (( ئومێد)) لە رێگای قاچاغەوە برایە دەرێی تورکیا لە فیستیڤاڵی فیلمدا بەشداریکردو خەڵاتی تایبەتی بەرکەوت. گۆنای, بەتۆمەتی ئەوەی فیلمێکی یاساغی ناردۆتە دەرێی تورکیاو باری ناجۆرو خراوی جوتیارێکی تورکیای لە وڵاتانی دیدا نیشانداوە لەلایەن حکومەتەوە خرایە ژێر تاقیبەوە. گۆنای, کۆمپانیای فیلمسازی خۆی بەنێوی ((گۆنای فیلم)ەوە دامەزراندو بوو بەدەرهێنە رو ئەکتەرو سیناریۆنووس 20–30 سیناریۆی نووسی کە بە شێوەی کتێب بڵاوبوونەوەو جەماوەرێکی زۆر ئەو کتێبەیان وەکو رۆمان خوێندەوە .تا ساڵی 1968 گۆنای ئەکتە رێکی بە نێوبانگ بوو .جەماوەر لە رێگەی فیلمەکانییەوە دەیانناسی, نەك وەك کەسایەتییەکی سیاسی و وەك بەشێك لە بزووتنەوەیەك.

ساڵی 1968, سەردەمی راپەرینی گەورە بوو لە فەرە نگستان وئەمریکا. سەردەمی بزووتنەوەی لاوان بوو. ئەمە لە تورکیاشدا رەنگی دابووەوە. .جەماوەر هێڵی ئاشکرایان لە نێوان بۆچوونە جیاوازەکان سەبارەت بە پەیوەندی لەگەڵ جیهاندا دەکێشا بۆ نموونە سەبارەت بە بەرقەراری سوسیالیزم لە رێگای هەڵبژاردنەوە و سوسیال دیموکراسی لە ژێر پەردەی سوسیالزمدا. هەندێ لە لاوەکان داواکاری دەست دانە چەك و جەنگ بوون دژ بە کۆنەپەرستیی و دژ بە ریڤیزنیستەکان لە یەکەم کودەتای ساڵی 1971دا, سوپا خەڵکێکی زۆری کوشت. رێکخراوە چەپەکانی دەمکوت کردو حکومەتی سوپایی دامەزرا. لەم سەردەمەدا رێکخراوە ساواکان, لەوانە حزبی کۆمۆنیستی ((مارکسیت– لینینست)) ی تورکیا, بە رێبەری ((ابراهیم کایپاکایا)) جەزرەبەی سەختی بە دەستی رژێمی فاشیستی خوارد.

یەڵماز, لەم بەینەدا نەلایەنی ریڤیژنیستەکان ونەلایەنی حکومەتی نەدەگرت. بەڵکولایەنی لاوەکانی گرت. هەندێکیان بۆ خۆحەشاردان پەنایان وە بەر ئەو برد. ئەمە خۆی لەخۆیداخاڵی وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە بواری گەلاڵە بوونی سیاسی ئەوداو وایلێکرد رۆلێکی چالاکانەی لە مەسەلەکاندا هەبێ.

دوای کودەتا, دەولەت جاڕی جەنگی دژ بە (( خەتەری کۆمۆنیزم))ی دا.

بۆ یەکەمجار لە مەیدانی سیاسیدا خەباتی چەکدارانە کەوتە گەڕ.

لاوان دەستبەرداری خەباتی خۆیان, خەباتی چەکدارانە نەبوون. درێژەیان بە جەنگداو بەرگرییان لەخۆو جەماوەر کرد. لەو دەمانەدا گۆنای, سێ شۆرشگێری لە ماڵی خۆیدا پەنا دابوو, لە کاتێکدا یاسای ((هەرکە بینیت تەقەی لێبکە)) ئەنجامدەدرا.

یەڵماز, دەستگیرکراو دووساڵ و نیو لە زیندانی سوپاییدا مایەوە. منیش لەو کاتانەدا لە زیندان بووم. بەڵام لە زیندانێکی سوپایی دیکەدا. لەم سەردەمەدا گۆرانێکی گرینگ بەسەر یەڵماز گۆنایدا هات: کتێبێکی بەنێوی (( هەندێ نامە لە سەلیمییەوە)) – ناوی زیندانە – نووسی کە دەکرێ بگوترێ رەخنە بوو لە خۆی. کتێبەکە بریتی بوو لە سێ چیرۆکی بەرز. بریاریدا لەوە بەدواوە راستەوخۆ بەشداری خەباتی خەڵکی وڵاتەکەی بکات. لەو زەمانەدا ئەوانەی دەگیران و دادگایی دەکران هەڵوێستی تەسلیم بوونیان وەردەگرت و لە ترسی تاقیب و تاقیبکردن لە داکۆکییەکانیاندا پەشیمان بوونەوەیان دەردەبری لەو شتانەی کە کردبوویان و لەشتی تریش.

یەڵماز, لە داکۆکییەکەیدا گوتی پەشیمان نییە لەوەی کردوویەتی و بابایەکی شۆڕشگێڕە، بەشێکە لە خەباتی تورکیا و شانازی بەم هەڵوێستەوە دەکات.

لە ساڵی 1974دا "ئەجەویت" هاتە سەر حوکم و حکومەتی سوپایی کۆتایی هات و بەخشینی گشتی دەرکرا. لەو بەخشینەدا گەلەك خەڵکی لە زیندان ئازاد بوون. لەوانە: من و یەڵماز. لەو چل و پێنج رۆژەدا کە لە دەرەوەی زیندان بوو فیلمێکی بە نێوی "دۆست"ەوە دەرکرد.

ئەمە یەکەم فیلم بوو دەربارەی کرێکارانی مەزراکانی لۆکەی ئەدەنە.

لە یەکەم هەفتەی دەرکردنی ئەم فیلمە لە یارێکدا، شەڕێك بوو، لەو شەڕەدا قازییەك هاتە کوشتن. وێڕای ئەوەی برازاکەی گۆنای لە دادگادا ئیعتراف کرد کە ئەو قازییەکەی کوشتووە, بەتۆمەتی شایەتی درۆ, دوو ساڵیان بە تەنگەداداو "گۆنای"یان بە تۆمەتی پیاوکوژی 19 ساڵان حوکمدا. لەزینداندا زۆریان جێ گۆڕکێ پێکرد، هەوڵیاندا بیکوژن, بەڵام ئەو بەریگریکردو مەسەلە نهێنی و پیرۆزەکانی رەچاوکرد. رۆمانێکی یەکجار نایابی بە نێوی "ئێمە رابەرێکمان دەوێ، یەك پەنجەرەو نان" نووسی، کە بایەخێکی گەورەی لە گەشەکردنی ئیدۆلۆژیکی ئەودا هەبوو. چونکە لە دوا پەنجا لاپەڕەکانی رۆمانەکەدا هاتۆتە سەرباسی مەسەلەی سوسیال ئیمپریالیزم.

لە نێو ئەو هونەرمەندانەدا کە کارەکانیان مۆرکی نێوەرۆکی کۆمەڵایەتی هەیە. هەڵوێست وەرگرتن دژ بە رووسیای سۆڤیەتی کارێکی ئاسایی نەبوو.

پاش زۆر باس و خواس و گفتوگۆ لە نێوان من و یەڵمازدا ئەوجا پەیمان بەوە برد کە بیرو ئامانجی هاوبەشمان هەیە. هەردووکمان نووسەری شۆڕشگێڕین و هەوڵدەدەین ببین بە مارکسیست–لینینست. ئەوم لە زینداندا بینی و بڕیارماندا کە من لە دەرەوە بیرو نەخشەکانی ئەو ئەنجامبدەم.

لە ساڵی 1979دا گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانەی سیاسی– رۆشنبیری شۆڕشگێڕی–مان بە نێوی "گۆنای"یەوە بڵاوکردەوە. گوشاری پۆلیس دژ بە گۆڤارەکە زیادیکرد. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەمە لە هەندێ خاڵدا لەگەڵ رەفتاری حکومەتی سوپاییدا یەکی دەگرتەوە. فاشیستەکان "گورگە بۆرەکان" بەهێزتر دەبوون و دەستیان لە کوشتنی خەڵکی نەدەپاراست بە تایبەتی نووسەرانی شۆڕشگێڕ. پاش ئەوەی هەژدە ژمارەمان لە گۆڤاری گۆڕین دەرکرد. هەموو ژمارەکان قەدەغەکران.

پاش ئەوەی من دەستم بە بەڕێوەبردنی کۆمپانیای فیلمی گۆنای کرد کە هێشتا فیلمی زۆری دەرنەکردبوو، بڕیارماندا کە کاری فیلمسازیمان فراوانترو بەهێزتر بکەین. ئەنجامی ئەو بڕیارەش

هەردوو فیلمی "مێگەل"و "دژمن" بوو. "مێگەل" یەکەم فیلم بوو کە لە دەرەوەی زیندان دەرکراو لە زینداندا بەڕێوەبرا.

یەڵماز گۆنای، سیناریۆکەی نووسی. پەیوەندیمان ئەوەندە بەتین بوو کە هاتنمە سەر ئەو باوەڕەی بەشێك لە رۆشنبیری شۆڕشگێڕی بریتییە لە هەرەوەزو یەکخستنی کارەکان. من لەگەڵ جەماوەردا قسەم کردو مەبەستەکانم برد بۆ زیندان، بۆ لای گۆنای. ئەویش بیرۆکەکانی لێکداو حەرەکەی فیلمەکەی دیاریکرد "گۆنای فیلم" دەستی بە کارکرد.

لە ساڵی 1980دا حکومەت گۆڤاری "گۆنای" داخست. هەندێ کتێبی من چاپ بوو بوون و من لەبەر گوتارێك کە لەلایەن یەڵماز گۆناشەوە هاتبووە ئیمزا کرن، دەستگیرو زیندانی کرام. لە راستیدا هەردووکمان لەسەر ئەوە ماوەیەك حەپسیمان کێشا. سەرەڕای ئەمەش، دوو ساڵان لەسەر کتێبێك کە دەربارەی "ابراهیم کایپاکایا"ی دامەزرێنەری حیزبی کۆمۆنیستی م.ل تورکیا نووسیم، گیرام. هەستمان بە نزیك بوونەوەی کودەتا کرد. من نەمدەتوانی لەوە پتر لە تورکیادا بمێنەوەو بڕیارماندا کە ئەویش دەرباز بکەین. من لە ساڵی 1980دا بۆی دەرچووم، پاشان. ئەویش هەر لە هەمان ساڵدا رایکرد.

گەلەك لە هونەرمەندان ترسان و سازشیان لەگەڵ بۆرژوازیدا کردو گوتیان نابێت هونەرو سیاسەت تێکەڵ بکرێن بۆیە یەڵماز گۆنای، یەکێکە لەو کەسە دەگمەنانەی کە هەڵوێستی دژ بە فاشیزمی هەڵبژاردووەو هەر لەبەر ئەمەشە رەنگە نێو دارترین رۆشنبیری تورکیا بێت.

کۆڵەمست نیشاندان و بەرزکردنەوەی وە کو "نیشانەیەکی کۆمۆنیزم" لەو دەمەدا کە فیلمەکە لە فیستیڤاڵی جیهانیدا خەڵاتی وەرگرت بایەخێکی گەلەك گەورەی هەبوو. چاپەمەنییە بۆرژوازییەکان ئەوەیان کرد بە مەسەلەیەکی گەورە.

**جهانی برای فتح:** ئایا فیلمە شۆڕشگێڕییەکانی دوایی ئەو لە نێو جەماوەری تورکیادا زۆر ناسراون؟!

**نیهایت بهرام:**

دەتوانن بۆ ماوەیەکی کەم فیلمەکە ببینن، پاشان لەلایەن کۆمیتەی فاشیستی سانسۆرەوە قەدەغە دەکرێن. جگە لە دە فیلم کە بە قاچاغی لە تورکیاوە دەرکراون، ئیدی هەموو فیلمەکانی تریان فەوتاندووە. هونتای تورکیا هەوڵدەدا هەر لە بناغەوە بیانسڕێتەوە. وێنەو پۆستکارتەکانی ئێستا لە دوکانچەکاندا نافرۆشرێن. جاران لە هەموو شوێنێکدا دەفرۆشران.

**جهانی برای فتح:**

چاپەمەنییەکان و هونتای تورکیا هەوڵیاندا ژیان و مەرگی ئەو چۆن لە جەماوەری تورکیا بگەیەنن؟

**نیهات بهرام:**

لە دووەم رۆژی مەرگی ئەودا، یەك رستە لە رۆژنامەکاندا دەبینرا "ئەو مرد" بەڵام بڵاوکراوەی "ئازادی"و چاپەمەنییەکانی فەرەنسا دوای مردنی ئەو قەدەغەکران.

جگە لە فاشیستە کەللە رەقەکان، چ چاپەمەنییەك لە سەرەتادا زاتینەکرد لە ستونەکانی خۆیدا هێرشی بکاتە سەر. ئەوان وێنەیەکی گەورەی ئەویان چاپکردو رادەی فرۆشتنیان زیاد کرد. پاشان مەجبور بوون کە هێرش بکەنە سەر یەڵماز.

یەڵماز کەسایەتییەکی گەلەك بناڤودەنگ بوو. بۆ وێنە ئەمە دەقی ئەو نووسینەیە کە رۆژنامەی "ترجمان"ی راستڕەو لەسەری نووسیوە: "بکوژانیش دەمرن. بکوژی عەرەقخۆر بەر لەوەی فریای خەرجکردنی ملیۆنان پارەکەی بکەوێ مرد. یەڵماز گۆنای بکوژی قازی. لە پاریس و بە نائومێدی مرد. بۆچی دەبێ بۆ ماڵباتی وی غەمگین ببین؟ چما قازی ماڵبات و کەسوکاری نەبوو؟ ئەو تا دوا هەناسە هەر بابایەکی خایەن بوو..."
مانشێتەکەی ئەمەیە "دوا چیرۆکی خیانەتی ئەو: نێژران لە گۆڕستانی پیرلاشز" ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی لاوازی هونتاو بە توانایی و کاریگەری قارەمانی جەماوەری خەڵك، یەڵماز گۆنای- یە.

**جهانی برای فتح:**

ئایا چ خاڵێکی دی هەیە کە بتەوێ ئیشارەتی بۆ بکەیت؟

**نیهایت بهرام:**

بەڵێ جگە لە هەندێ فاشیست، ئیدی هەموو هەر تا زێباری ئەون. ئەو لە هێزە شۆڕشگێڕەکانەوە نزیك بوو. لە خۆپیشاندانی بەرەو استراسبورگ و لە مانگرتن لە نان خواردن، هەر چەندە نەخۆشبوو، بەشداریکرد. گۆنای قارەمانێکی جەماوەرییە، ئەفسانەیەکە بۆ خۆی، بەشێکە لە هەموو خێزانێك، چونکە دژ بە ستەم، فاشیزم، بێعەدالەتی و ئەشکەنجە بوو. تەنانەت ئەگەر زۆر هۆشیارانەش خۆشیان نەوێ، ئەواغ بە قووڵی خۆشیان دەوێ. مەرگی ئەو داخ و کەسەرێکی گەورە بوو بۆ جەماوەر، چونکە بۆ ئەوان رەمزی سەرفرازی و گەردنگەشییە، ئەو گەردنگەشییەی لە خۆیاندا هەستی پێدەکەن. یەڵماز خۆیشی تەئکیدی لەسەر ئەوە دەکرد کە شۆڕش تەنیا لە نێو بردنی دەوڵەت و رووخاندنی نییە بەڵکو شۆڕشگێڕاندنی هەموو کۆمەڵە.

## فیستیڤاڵی هونەریی پەنجاب
## پیرۆزبێت یادی یەڵماز گۆنای

جالانداهار: لە رۆژی 26 کانونی دووەمی ئەمساڵدا، لە کاتێکدا حوکمڕانان و پلەو پایەدارانی هند لێرەدا سەرگەرمی جەژن و ئاهەنگێرانی دەوڵەتی بوون بە بۆنەی "رۆژی کۆماری"یەوەو لە ستۆدیۆیەکدا کۆبوو بوونەوە، خەڵکی جالانداهار، لە "دیش باگات"ی یادگاری هال "هۆڵێکە کە بە یادی شەهیدێکی شۆڕشگێڕ دروستکرابوو" خەریکی ئەنجامدانی بەرنامەیەکی دی بوون.
بەرنامەکە بەسەرپەرشتی ئەنجوومەنی کولتووری خەڵکی پەنجاب و بە سەرۆکایەتی "کورشاران سینگ" کە درامانووسێکی پایە بەرزو پڕ هەوادارە، بەڕێوەدەبرا، لە بەرنامەکەدا کولتوری شۆڕشگێڕی کە لەگەڵ راپەرینی ((ناکسالباری)) لە ساڵەکانی 1960 دا بەرپا بوو بوو

بەرجەستەکرا. نزیکی نیوەڕۆ هۆڵەکە پڕبوو لە ((1500)) کرێکاری شۆڕشگێڕ, دیموکراتەکان و فەرمانبەرانی کولتوری کە لە تەواوی شارەکانەوە هاتبوون. گەلەك لە کرێکارانی ((نبالی)) ش بەشداریيان تێداکرد. بەرنامەکە بە سروودی ئەنتەرناسیونال دەستی پێکردو نزیکەی هەڤدە سەعاتی خایاند. بەرنامەکە بریتی بوو لە سروودی شۆڕشگێڕی، شیعرو شانۆگەری. گشت ئەو شانۆگەريانەی ئەو شەوە پێشکەش کران، بە گیانی گەورەترین فیلمسازی شۆڕشگێڕ، بە یەڵماز گۆنای پێشکەش کرابوون.

لە سەرەتای ئاهەنگەکە هەموو پیاوان و ژنان و منالان و تەماشاکەران هەستانە سەر پێ و دوو دەقیقە بۆ گیانی ئەم کەڵە هونەرمەندە شۆڕشگێڕە راوەستان.

"هونەر چەکێکە، هونەر تفەنگێکە، هونەر زمانێکە... هەر کە رێزی ئەم زمانە نەگرن، ئەم چەکە دەتانکوژێت"، ئەم گوتەیەی یەڵماز بە خەتی درشت لەسەر لافیتەیەك نووسرابوو ، و لەسەروو شانۆکەوە هەڵواسرابوو.

ئەو دەمەی کە وێنەکانی ژیان و فیلمەکانی یەڵماز، کە لە ژمارە، یەکی گۆڤاری جهانی برای فتح، دەرهێنرابوون، پێشکەش بە "گورشاران سینگ"، ئەو گورشاران سینگ-ەی هەندێك کەس و خەڵك بە یەڵماز گۆنای پەنجابی دەزانن، کران... سەدای دروشمی شۆڕشگێڕانە لە هۆڵەکەدا دەنگی دایەوە. گورشاران کە بەزەحمەت کونترۆڵی هەست و سۆزی خۆی پێدەکرا، بەڵێنیدا کە عەزمی جەزم بکات و بە لە خۆبردوويی پترەوەو بە متمانەی تەواو بە شۆڕش کار بکات و داوای لە خەمخۆران و چالاکانی مەیدانی رۆشنبیری سەرانسەری جیهانکرد کە لە هەوڵ و تەقەلا و خەباتیاندا بۆ رۆشنبیری جەماوەری، سوود لە یەڵماز گۆنای وەربگرن و لەوەوە فێر بن.

## هەندێ لەو خەلاتانەی بە گۆنای دراون

ئەگەرچی گۆنای بەربەرەکانییەکی زۆر کراوە، بەڵام بە زەبری رەسەنایەتی کارەکانی بوونی خۆی سەلماندووەو هیچ سینەماکارێکی کورد هێندەی ئەو خەلاتی نەبردۆتەوە کە ئەم لیستە نموونەی هەندێك لەو خەلاتانەیە:

1- فیستیڤاڵی ئەنتاکیا- 1967: خەلاتی باشترین ئەکتەر لە دەوری پیاواندا، لە فیلمی (یاسای سنوور).

2- فیستیڤاڵی ئەزەنە- 1969: خەلاتی سێیەم لەسەر فیلمی (سەید خان) خەلاتی باشترین ئەکتەری رۆڵی پیاوان لە فیلمی (سەید خان)دا.

3- فیستیڤاڵی ئەزەنە- 1970:/ خەلاتی باشترین فیلم لەسەر فیلمی (ئومێد) خەلاتی باشترین سیناریستی ساڵ، خەلاتی باشترین ئەکتەری پیاو لە (فیلمی ئومێد)ا.

4- فیستیڤاڵی ئەنتاکیا- 1970: خەلاتی باشترین فیلم لەسەر فیلمی (ناحەز) خەلاتی باشترین ئەکتەری پیاو لە فیلمی (ناحەز)دا.

5- فیستیڤاڵی ئەزەنە- 1971: خەڵاتی یەکەمی فیستیڤاڵەکە لەسەر فیلمی (شیوەن) خەڵاتی دووەمی فیستیڤاڵەکە لەسەر فیلمی (ئومێد) خەڵاتی سێیەمی فیستیڤاڵەکە لەسەر فیلمی (نا ئومێدان)، خەڵاتی باشترین سیناریستی ساڵ.

- خەڵاتی باشترین دەرهێنەری ساڵ
- خەڵاتی باشترین ئەکتەری پیاو

فیستیڤاڵی ئەزەنە- 1972:

- خەڵاتی یەکەمی میهرەجانەکە لەسەر فیلمی (باوك)
- خەڵاتی رەخنەگران لەسەر فیلمی (باوك)
- خەڵاتی باشترین ئەکتەری پیاو لە فیلمی (باوك)دا.

فیستیڤاڵی گرنیوبلی جیهانی:

- خەڵاتی تایبەتی داوەران لەسەر فیلمی (ئومێد)

فیستیڤاڵی ڤینیسیای نێو دەوڵەتی:

*خەڵاتی رەخنەی جیهانی لەسەر فیلمی (شیوەن)

*خەڵاتی ئورهان کەمال (گەورەترین خەڵاتی ئەدەبییە لە تورکیا) لەسەر رۆمانی (ماتوا واعنافهم ملویە).

فیستیڤاڵی ئەنتاکیا- 1975:

- خەڵاتی یەکەمی فیستیڤاڵەکە لەسەر فیلمی (نیگەرانی)
- خەڵاتی دووەمی فیستیڤاڵەکە لەسەر فیلمی (هاوڕێ)
- خەڵاتی سێیەمی فیستیڤاڵەکە لەسەر فیلمی (دەربەدەران)
- خەڵاتی باشترین سیناریستی ساڵ.

فیستیڤاڵی بەرلینی نێو نەتەوەیی- 1977:

- خەڵاتی رێزلێنان لەسەر هەموو بەرهەمەکانی.

فیستیڤاڵی بەرلینی جیهانی- 1979:

- خەڵاتی فیلمی کاتولیکی جیهانی
- خەڵاتی فیستیڤاڵی فیلمی جیهانی
- خەڵاتی گەورەی داوەران
- خەڵاتی سێوی ئاڵتوونی
- خەڵاتی دیکۆمێنتی سینەمایی بەلچیکی لەسەر فیلمی (مێگەل)
- 1980- لە لەندەن:
- خەڵاتی خۆشترین و خەیاڵیترین فیلم لەسەر فیلمی (مێگەل)

1980- لە بەلچیکا:

* خەڵاتی فەمینا لەسەر فیلمی (مێگەل)

1980- لە ئەسپانیا (میهرەجانی فالانس):

* خەڵاتی گەورە لەسەر فیلمی (مێگەل)

فیستیڤاڵی ئەزەنە- 1981:

- خەڵاتی باشترین سیناریست لەسەر فیلمی (دژمن)

فیستیڤاڵی لوکارنوی (32)- 1981:

- خەڵاتی (کران بری) لەلایەن داوەرانەوە لەسەر فیلمی (مێگەل)

فیستیڤاڵی کانی نێو دەوڵەتی سی و پێنجەم- 1982:

- خەڵاتی (گەڵای ئاڵتوونی- السعفة الذهبية) کەگەورەترین خەڵاتی جیهانە لە بواری سینەمادا. لەسەر فیلمی (ڕێگا).

بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە ڕاستەوخۆ سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

د. ابراهيم محمود


1- يلماز گۆنای ودور السينما الوثائقية في النضال الوطني ط 2/ اربيل/2000 رابطة كاوا للثقافة الكوردية.

2- دراسات كردية العدد 3-7 السنة الثامنة 1992 استلهام المجال الطبيعي في سينما يلماز گۆنای "الامل" و "القطيع" جان مارك بينيه ص 61- 74.

3- مێگەل، لەلایەن ڕێزدار کوردو عەلی (دکتۆر سەروەت محەمەد ئەمین-ەوە لە ئەڵمانییەوە کراوە بە کوردیو چاپو بڵاوکراوەتەوە.

4- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆکێکی یەڵماز گۆنایە بۆ منداڵان کاتی خۆی لە چیاو بەدەم پێشمەرگایەتییەوە لەلایەن حەمەکەریم عارفەوە لە فارسییەوە کراوە بە کوردیو بە تیراژی زۆر کەم چاپو بڵاوبووەتەوە.

5- گۆڤاری (کارگر انقلابی) ژمارە: 1 ساڵی 1983

6- گۆڤاری (جیهانی برای فتح) ژمارە: 1363/1 ل 77- 78 نووسینی أ. د.

7- گۆڤاری (جیهانی برای فتح) ژمارە: 1363/1 ل 79- 81 هەڤپەیڤین لەگەڵ: نیهایت بهرام.

8- (جیهانی برای فتح) ژمارە: 1364/2 ل 59. نووسینی پەیامنێری تایبەتی گۆڤاری جیهانی برای فتح.

9- ئەو دیوی مەرگ: حەمەکەریم عارف، چاپی یەکەم 2001 دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی موکریانی/ کوردستان- هەولێر. ل271- 290.


## حەمە کەریم عارف

- کەرکووکییە و لە ساڵی 1951دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی 1975 کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (170) ڕۆژنامەی هاوکاری ساڵی 1973 بڵاوبووەتەوە.

- له ساڵی 1976ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك, نووسەری کوردستان, کەلتوور, نووسەری کورد, گوڵانی عەرەبی, ئاڵای ئازادی تا ژمارە 00222, گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی, بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك, نووسەری کوردستان, کەلتوور, ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: 222 بەناوی گۆڤەند, زنار, سیپان, پاکزاد, محەمەدی حاجی, سیروان عەلی, دیدار هەمەوەندی, هێژا, ح. ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و ڕێکخراوێکی سیاسی نەبووە, لە ساڵی 1974 – 1975دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە, لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ, بێ وابەستەگی حیزبی, پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات, چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە, لێ زۆربەی هەرە زۆریان, بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاو بوونەتەوە, لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان ڕزگار بوون. هەندێك لە وانە:

1- تیرۆژ, کۆ چیرۆك, چاپی یەکەم 1979
2- کۆچی سوور, ڕۆمان, چاپی یەکەم 1988
3- بەیداخ, چیرۆك, 1988
4- داوەتی کۆچەرییان, کۆ چیرۆك چاپی دووەم 2005
5- لە خۆ بێگانە بوون, کۆمەڵە چیرۆك, چاپی یەکەم (1999) دەزگای گوڵان
6- کوچ سرخ, کۆ چیرۆك, بە فارسی, وەرگێران چاپی یەکەم 1987 شاخ
7- نینا, ڕۆمان, سابت ڕەحمان, دوو چاپ, شاخ, شار 2002
8- نامۆ, ڕۆمان, ئەلبیر کامۆ, دوو چاپ, شاخ, شار 2003 دەزگای ئاراس
9- ڕێبەر, ڕۆمان, مەهدی حسین, یەك چاپ (شاخ)
10- شکست, ڕۆمان, ئەلکساندەر فەدایەف, چاپی شاخ (ڕاە کارگر)
11 – هاوماڵەکان, ڕۆمان, ئەحمەد مەحموود, دوو چاپ, شاخ, شار 2000 گوڵان
12- بێناسنامەکان, ڕۆمان, عەزیز نەسین, 3 چاپ شاخ, شار 2003
13- قوربانی, ڕۆمان, هیرب میدۆ, چاپی یەکەم 2004 دەزگای شەفەق

14- دووره ولات, رۆمان ع. ڤاسموف, چاپی یەکەم2000 دەزگای گولان
15- ئازادی یا مەرگ, رۆمان, کازانتزاکیس, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران
16- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی, دوو چاپ, شاخ, شار 2004 کتێبخانەی سۆران هەولێر
17- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی, چاپی شاخ 1985
18- دلێریی خۆراگرتن, ئەشرەف دەهقانی, چاپی شاخ
19- مەسەلەی کورد لە عێراقدا, عزیز شەریف
20- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد, ئیحسان نوری پاشا, یەك چاپ
21- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ, مەسعودی ئەحمەد زادە, چاپی شاخ
22- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو, د. کوینتەر دیشنەر, چاپی شێیەم 2004 دەزگای ئاراس
23- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس, نەجەف قولی پسیبان
24- گوزارشتی مۆسیقا, د. فۆاد زەکەریا.
25- دەربارەی شیعر و شاعیری, رەزا بەراهەنی.
26- ڤنسنت ڤان گوگ, شانۆنامە, باول ئایز لەر
27- بە دوعا شاعیرەکان, شانۆنامە, جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:12)
28- جولەکەکەی مالْتا, شانۆنامە, مالرۆ.
29- دادپەروەران, شانۆنامە, ئەلبیر کامۆ.
30-بەد حالْی بوون, شانۆنامە, ئەلبیر کامۆ.
31- چاو بە چاو, شانۆنامە, گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)
32- ریچاردی سێیەم, شانۆنامە, شەکسپیر.
33- گەمەی پاشا و وەزیر, شانۆنامە, عەبدوڵلائەلبوسێری.
34- کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا, چاپی یەکەم 1998 وەزارەتی رۆشنبیری.
35- هونەر و ژیانی کۆمەلایەتی, پلیخانۆڤ, چاپی یەکەم 2005 دەزگای موکریانی
36- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت, ئیڤلین رییدر.
37- لێکدانەوەیەك لە مەڕ نامۆ, لویس ریی.
38- منداڵە دارینە, چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
39- فاشیزم چیی؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان, یەلماز گونای
40- شوانە بچکۆلەکە, چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان
41- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالان)
42- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.
43- کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی (23 ئەفسانە)
44- زندە خەون, کۆمەڵە چیرۆکی چیخوف, چاپی یەکەم (2001) دەزگای موکریانی
45- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی, چاپی یەکەم (2004) کتێبخانەی سۆران, هەولێر

46- جیٚ پیٚ, کۆمەڵێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان:(سادقی هیدایەت, جەلال ئال ئەحمەد, بوزرگی عەلەوی, سادقی چوبەك, مەنسوری یاقوتی)
47- چیرۆکستان, کۆمەڵێك دەق و ڕەخنە, چاپی یەکەم 2005 نووسەرانی کەرکووك
48- چۆنیەتی فێر بوونی زمانی فارسی, چاپی یەکەم (2000) حەمە کەریم عارف
49- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف
50- پەلکە ڕەنگینە, حەمە کەریم عارف, چاپی یەکەم (2004) وەزارەتی رۆشنبیری
51- کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە
52- چزیشفسکی, فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
53- چایکۆ فسکی, ژیان و بەرهەمی.
54- ئیدگار ئالین پۆ, ژیان و بەرهەمی.
55- جاك لەندەن, ژیان و بەرهەمی
56- گوگول, نووسەری ریالیست
57- یەڵماز گونای, ژیان و بەرهەمی
58- سادقی هیدایەت, ژیان و بەرهەمی
59- خافرو غ لە شیعر دەدویٚ, ژیان و بەرهەمی
60- ڕێبازە هونەرییەکانی جیهان
61- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا, چاپی یەکەم (2004) دەزگای سپیرێز
62- ڕاگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا ( بە شەریکی) چاپی یەکەم (2001) دەزگای گوڵان
63- ڕاگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا, حەمە کەریم عارف
64- دیدار و دەق و ڕەخنە.
65- دیداری چیرۆکڤانی.
66- قوتابخانە ئەدەبییەکان, ڕەزا سەید حسەینی.
67- ناودارانی ئەدەب, حەمە کەریم عارف
68- هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی, حەمە کەریم عارف.
69- کورد لە سەدەی نۆزدە و بیست دا, کریس کۆچرا, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران
* لە ڕاپەڕینەوە تا ئەوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..
* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن, ئامادەیە بە خۆڕایی پێشکەشیان بکات و...